# مردن و ژیانی ناو گۆڕ

## له قورئان و فه‌رمووده صه‌حیحه‌کان دا



ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ

نووسینی

محمد ملا فائق شاره‌زووری

چاپی شه‌شه‌م

١٤٣٠ هـ ٢٠٠٩ م

نارین

# مردن و ژیانی ناو گۆڕ

## لەقورئان و فەرموودە صەحیحەکان دا


نووسینی

محمد ملا فائق شارەزووری



چاپی شەشەم

١٤٣٠ هـ

٢٠٠٩ م

نارین

📖 ناوی کتێب : مردن وژیانی ناو گۆڕ لە قورئان
وفەرموودە صەحیحەکاندا.
✍ نووسینی : محمد ملا فائق شارەزووری.
❁ ژمارەی لاپەڕە: ١٥٥
❁ نۆرەی چاپ: شەشەم
❁ ژمارەی تیراژ:٢٠٠٠
❁ ساڵی چاپ : ١٤٣٠ هـ - ٢٠٠٩ م .
❁ ژمارەی سپاردن: (٤٨٣)ی ساڵی ١٩٩٩ م.

تێبینی :

بۆ دەست کەوتنی ئەم بەرهەمە بە(کۆ) پەیوەندی بکە
بەم ژمارە مۆبایلەوە: ٠٧٧٠١٥٥٤٠٨٥

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

**إن الحمد الله ،نحمده ونستعينه ونستغفره ، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له ،وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك لَهُ ، وَ أشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَ رَسولُهُ .**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ (آل عمران :١٠٢).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ (النساء /١).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ (الأحزاب :٧٠-٧١).

**أمّا بعد فإنَّ أصدَقَ الحديثِ كتابَ اللهِ وَ خَيرُ الهَدي هَديُ محمد (ﷺ) وَ شَرَّ الأمورِ مُحدَثاتُها ، وَكُلَّ مُحدَثةٍ بدعة ، وَ كُلَّ بِدعَةٍ ضَلالة وَ كُلَّ ضَلالةٍ في النّار*.**

زۆر جار لە سورەت و ئایەتەکانی قورئاندا خوای گەورە بەڵگەو نمونەی جوانمان بۆ دەهێنێتەوە لەسەر نەمان و کۆتایی پێهاتنی ئەم بوونەوەرەو ئەوەی کە تیایدا هەیە وە زۆر لە دیمەنەکانی مردنمان بۆ ڕوون دەکاتەوە وە بەهەمان شێوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووردەکاریەکانی مردنی بۆ ڕوون کردوینەتەوە وە هەروەها هاوەڵە بەڕێزەکان و نەوەکانیان و زانایان ئەو زانستەیان بە ئێمە گەیاندووە وەك زانایانی پایەبەرز (**ابن أبي الدنيا، البيهقي ، الإمام القرطبي ، ابن القيم الجوزية، ابن رجب الحنبلي ، الإمام السيوطي، ابن كثير، و الإمام السفاريني**)وە چەندەهای تریش. لەم نوسراو دا هەرچەند لە توانامدا بوو بێت هەوڵم داوە کە ئەو بەڵگە و ڕوون کردنەوانە کۆبکەمەوە لەبەرهەمی ئەو زانایانە و لێی بکۆڵمەوە و بیخەمە پێش چاوی برایانی موسڵمانم ، بۆ ئەوەی ووشیارکەرەوەیەك بێت بۆیان وە یادی مردن و قیامەتیان لەبیر بێت وە بزانن چی

---

* ئەمە پێی دەوترێت (**خطبة الحاجة**) کە هەمیشە پێغەمبەر (ﷺ) ووتارەکانی بەمە دەست پێ دەکرد.وە بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە سەیری کتێبی (**خطبة الحاجة**) بکە لاپەڕە (١٤ــ ١٩) کە شەش لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) گێڕاویانەتەوە.

سوودیان پیّ دەگەیەنیّت دوای مردن؟. وە ژیانی ڕاستەقینەو نەبڕاوە کامەیـە ؟ وە خۆشـی ئـەو ژیانە لە کویّدایە ؟ وە هۆیەکانی بە دەست هیّنانی ئەو ژیانە سەر فەرازیە کامەیە؟ بەلاّم ئەمـە نابیّتە بەڵگە بۆ فەرامۆش کردنی ژیانی دونیا چـونکە هەوڵـدانیش بـۆ ژیـانی دنیـا پیّویـستە بەشیّوەیەکی شەرعی وەك خوای گـەورە دەفـەرمووی :﴿ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾ (القصص : ٧٧) .

**اللهم انفعني بما علَمتني و علّمني ما ينفعني وزدني علما ينفعني . آمين**

محمد ملا فائق شارەزووری

**الأحد /١٧صفر /١٤٢١ هجرية**

ڕێکەوتی ٢١/٥/٢٠٠٠ .

---

(*) وە بەبۆنەی دەرچوونی چاپی پیّنجەم ئەم نوسراوەوە بە خویّنەرانی بەڕیّز ڕادەگەیەنین کە ئەم چاپە لەگەڵ چاپەکانی تردا چەند جیاوازیەکی هەیە ، لە ڕووی زیادکردنی هەندیّك بابەت و لابردنی هەندیّك بابەتی تر ، وە چەند ڕوون کردنەوەیەکی تر ، وە هەروەها پوختەکردنی ئەم بابەتە لە چەندها ڕووی ترەوە . هیوادارم ئەم کتیّبە ببیّتە ڕیّگە ڕۆشن کەرەوە بۆ برایان و خوشکانی موسوڵمانی بەڕیّزم ،بۆ ئەوەی چاکتر لە ژیانی ناو گۆڕ شارەزابن و خۆیانی بۆ ئامادەبکەن .

# ئایە دروستە ئاوات خواستن بە مردن و داواکردنی ؟ وە ئەگەر دروست بێت چ کاتێك دروستە؟

صەحابی بەڕێز ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی : ((لا يتمنين أحدكم الموت لضرٍ نزلَ به...))[1] واتە : هەرگیز ئاوات بە مردن مەخوازن کاتێك ناخۆشی و ناڕەحەتیتان بەسەردا دەیت.

کەواتە ئاوات خواستن بە مردن سەرەتا قەدەغەیە لەبەرئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قەدەغەی کردووە و چونکە سێ زیانی گەورەی تێدایە بۆ ئادەمیزاد:

١- ئادەمیزادی خاوەن باوەڕ بمرێت کۆتایی بە هەموو کردەوەکانی دونیای دێت و نامەی کردەوەکانی دەپێچرێتەوە تاوەکو رۆژی دوای ، وەك لە فەرموودەکەی ئەبوهورەیرەدا هاتووە (رضي الله عنه) کە گێڕاویەتەوە لە پێغەمبەری خواوە کە (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : **((لا يتمنين أحدكم الموت و لا يدعوا به من قبل أن يأتيَهُ أنه إذا مات أحدكم إنقطع عمله و أنه لا يزيد المؤمن من عمره إلا خيرا))**[2] واتە: هیچ یەکێك لە ئێوە ئاوات بە مردن نەخوازێت پێش ئەوەی بگاتە لای چونکە هەر یەکێك لەئێوە گەر بمرێت کۆتایی بە کردەوەکانی دێت وە باوەڕدار تا ژیانێکی درێژتر بەسەربەرێت لە دونیادا خێرو چاکەی زیاتر دەبێت.

٢- ئەگەر ئێمە داخوازی مردن بکەین ئەوا دوو شتی چاکمان لە دەست دەچێت کە ئەویش زیاکردنی کارە چاکەکانە یاخۆد سڕینەوەی کارە خراپەکانە چونکە لەماوەی تەمەن درێژیدا ئادەمیزاد کردەوەو ڕەفتاری چاکە زۆر دەکات وە ئەگەر خراپەکاریش بێت پەشیمان دەبێتەوە و دونیای بۆ دەردەکەوێت و دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە وەك پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت : **((لا يتمنين أحدكم الموت إما محسنا فلعله يزداد و إما مسيئا فلعله يستعتب..))**[3] واتە: هیچ کەسێکتان ئاوات نەخوازێت بە مردن چونکە ئەو کەسە ئەگەر چاکەکار بێت دەگونجێت چاکەکانی زیاتر بکات وە ئەگەر خراپەکار بێت دەگونجێت تەمەنێکی

---

(١) أخرجه: البخاري في ((الصحيح)) (٦٣٥١)، و مسلم في ((الصحيح)) (٦٧٥٥).

(٢) أخرجه : مسلم في ((الصحيح)) (٦٧٥٧) .

(٣) أخرجه : البخاري في ((الصحيح)) (٥٦٧١) ، والنسائي (١٨١٨).

درێژ ببارتە سەر و بگەڕێتەوە بۆلای خواو واز لە خراپەکاری بهێنێت. ... وە هەروەها یەکێك لە خاڵەکانی تر کە پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردووە ئەوەیە کە دەفەرمویت: ((**لا تمنوا الموت فإن هول المطّلع شديد وإن من السعادة أن يطول عمر العبد ويرزقه الله عز وجل الإنابة**))[٤] . واتە : هەرگیز ئاوات بە مردن مەخوازن چونکە ناڕەحەتی (**مطلع**)[٥] زۆر سەختە وە مایەی بەختەوەری موسوڵمان تەمەن درێژییەتی چونکە هیوا وایە خوای گەورە لە کۆتایی تەمەنی دا ماوەی بدا و گەڕانەوەی بۆلای خواپەرستنەکەی پێ ببەخشێت.

٣- داوا نەکردنی مردن ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە تەمەن درێژ خاوەنی پلەیەکی بەرز دەبێت لای خوای گەورە وە پاداشتێکی یەکجار گەورەشی بەدەست دەکەوێت لە بەهەشتدا إنشاء الله: صەحابی بەڕێز ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) دەفەرموێت : (( **أن رجلا قال : يا رسول الله (ﷺ) أي الناس خير ؟ قال : ((من طال عمره و حسن عمله)) قال : فأي الناس شر؟ قال: ((من طال عمره و ساء عمله))**))[٦] واتە: پیاوێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) وە ووتی: لە ناو موسوڵمانانداا کێ زیاتر باشە لای خوای گەورە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ( ئەو کەسەیە کە تەمەنێکی درێژی بردبێتە سەر لە ژیانی دا وە کردەوەو ڕەفتاریشی باش بوبێت) وە پرسیار کرا : کام لە خەڵکان خراپترە؟ فەرمووی : (ئەوەی کە تەمەنی درێژ بێت وکردەوەی خراپ بێت)[٧] وە هەرگیز عیبادەتی ئادەمیزادێکی تەمەن هەشتا ساڵە لەگەڵ تەمەن بیست ساڵەدا ناچنە ڕیزی یەك تەرازووەوە تەمەنیش بۆ ئادەمیزادی خاوەن باوەڕ تا درێژ تر بێت

---

(٤) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (٣٣٢/٣) رقم : (١٤٥٦٤) وقال محققه الشيخ الأرناوط : إسناده يحتمل التحسين ، والبزار في ((المسند)) رقم (٣٢٤٠) ، والبيهقي ((الشعب)) (١٠٥٨٩) وقال ابن الحجر الهيثمي ((المجمع الزوائد)) (١٧٥٤٣) رواه أحمد والبزار وإسناده حسن ، وعن عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) أنه لما حضرته الوفاة قال : (لو أن لي ما على الأرض لأفتديت به من هول المطلع) أخرجه :أبو نعيم ((الحلية)) (٥٢/١) ، وابن أبي الدنيا : ((كتاب المحتضرين)) (٤٣) و (كتاب المتمنين) (ص :١٣) ، والذهبي ((تأريخ الإسلام)) (٢٧٨/١) .

(٥) (المطلع) (لێرەدا مەبەست لە وشەی مطلع کەوتنە خوارەوەی یەکێکە لە ناکا و لە شوێنێکی بەرزەوە مەبەستیش لێرەدا کەوتنە خوارەوەیە بۆ ناو گۆڕ و مردن)

(٦) أخرجه : أحمد (١٩٠/٤) ، والترمذي في ((السنن)) (٢٣٣٠)، والطبراني في ((المعجم الصغير)) (٨١٨) ، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) رقم (١٧٥٤٧) رواه الطبراني في الصغير وإسناده جيد ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٨٩٩) وفي ((السلسلة الصحيحة)) (١٨٣٦).

(٧) أنظر : توضيح ذلك في : ((الفوائد)) لابن القيم، صفحة (٣٣٢).

چاکترە ... وە لە ڕیوایەتێکی تردا لە ـ پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەفەرموێت : ((... **ليس أحد أفضل عند الله عز وجل من مؤمن يُعمّر في الإسلام لتسبيحه وتكبيره وتهليله وتحميده..**))[8]. واتە : هیچ کەسێك چاکتر نی یە لای خوا لە ئادەمیزادێکی خاوەن باوەڕ کە لە ئیسلامەتیدا تەمەنێکی درێژی بردبێتە سەر لەبەر سێ شت لەبەر ئەو هەموو ((**سبحان الله ، الحمد لله والله أكبر لاإله إلاّ الله** ...)) ی کە وتوویەتی لە تەمەنێکی درێژیدا ئەوە وای لێ کردووە کە چاکترین کەس بێت لەناو برایانی خۆیدا ، وە باشترین فەرموودە بۆ ئێمە کە بەڕاستی ئامۆژگاریەکی کاریگەر بێت بۆ تەمەن درێژی فەرموودەکەی ـ **طلحة** ـ یە(رضي الله عنه) کە خۆی دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێت : (دوو برا هاتن لەهۆزی ـ بلی ـ لە ناوچەی (**قضاعة**) کە عەرەب بوون لە نزیك ڕۆمەکانەوە بوون دەفەرموێت :- هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وە هەردووکیان موسوڵمان بوون ، یەکێکیان زیاتر بەندایەتی دەکرد ئەوەی کە زیاتر بەندایەتی و چاکە کردنی دەکرد لە غەزایەکدا شەهید بوو براکەی تری کە بەندایەتی و چاکەکردنی کەمتر بوو لە برا شەهیدەکەی دوای ئەو بە یەك ساڵ تەمەنی زیاتر بەسەر بردو وەفاتی کرد ـ **طلحة** ـ دەفەرمووێت :- من بینیم لە خەودا من لە بەردەرگای بەهەشت دا بووم فریشتەیەك ڕێگەی دا بە براکەی تری کە ساڵێك دوای شەهیدە کە مردبوو بچێتە ژوورەوە و پاش ماوەیەك هاتەوە و ڕێگەیدا بە شەهیدەکە و ئەویش چووە ژوورەوە، وە دوای ئەو گەڕایەوە بۆ لای من و ووتی : بگەڕێرەوە ئێستا نۆبەی تۆ نەهاتووە بێیتە ژوورەوە، دەفەرموێت :- کە بەیانی بووەوە ـ **طلحة**ـ ئەم خەوەی گێڕایەوە بۆ هاوەڵەکانی ئەوانیش زۆریان بەلاوە سەیر بوو کەسێکی عیبادەت کار لە غەزادا شەهید بووە بەڵام براکەی کە عیبادەتی زۆر نەبووە و شەهیدی بە نسیب نەبووە تەنها ئەوەندە نەبێت کە ساڵێك دوای ئەو تەمەنی بەسەر بردووە بە چاوی خۆی چۆن لە خەودا بینی پێش برا شەهیدەکەی کەوتووە بۆ چوونە ناو بەهەشت . هەواڵ گەیشتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ) وە فەرمووی : ((ئایا ئەو برا مردووەی کە ساڵێك دوای ئەو مرد ئایا دوای شەهید بوونی ئەو مانگی ڕەمەزانی نەگرت وە شەش هەزار ڕکات نوێژی نەکرد وە (ئەوەندو ئەوەند) ڕکات

---

(٨) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (١٤٠١) وقال محققه الشيخ الأرناؤوط : حسن لغيره ، والبزار في ((المسند)) (٣٥٩٠) ، و أبو يعلى في ((المسند)) (٦٣٤) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (ترتيب صحيح للجامع) (٣/٣٤٨) .

سوننەتی نەکرد ؟ [(٩)] ئەو پلە بەرزی و جیاوازیەی نێوان ئەو دوو برایــە وەك جیــاوازی و دووری نێوان زەوی و ئاسمان وایە ...))[(١٠)] .

وە هەروەها لە ڕیوایەتێکی تردا لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(ﷺ) دەفــەرموێت : (دوو برا هەبوون لە زەمانی پێغەمبەردا (ﷺ) یەکێکیان زۆر چاکتر بوو لەوی تریــان ئــەوی کــە زۆر چاکتر بوو مرد ، وە براکەی تری لەدوای ئەو بە چل ڕۆژ ئەویش مرد وەکاتێك کە باسی ئەو دوو برایە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کرا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( ئایا ئەو برایەی تری کە دوای چــل ڕۆژ وەفاتی کردووە نوێژی نە دەکرد؟ ) ووتیــان بــەڵێ : وە پێغەمبــەر(ﷺ) فــەرمووی: (ئێــوە نازانن ئەو نوێژە چەند پلەی ئەو برایەی بەرز کردووەتــەوە لــەبرا پێــشووەکەی تــری) [(١١)]. بــەم شێوەیە دەرکەوت کە ئاوات خواستن بە مردن چاك نی یە بۆ موسوڵمان چونکە تا بــژی و خــوای گەورە پشت و پەنای بێت و ڕێنموویی بکات و سەرکەوتووی بکات ئەو کەسە پلەی بەرزو چاکتر بۆ خۆی مسۆگەر دەکات بۆ قیامەت ، بەڵام لە هەندێ کــاتی دژواردا کــە موســوڵمان بترســێت تووشی فیتنەی وا ببێت کە ببێتە هۆی لە دەست دانی ئاین و بیر و باوەڕی بێگومان ئەو کەسە مردنی چاکترە لەوەی کە ئاین و باوەڕی لە دەست بدات بۆیە یەکەم کەس کە داوای مردنی کــرد پێغەمبەر (یوسف) بوو (علیــه الــسلام) دوای ئــەوەی کــە خــوای گــەورە بــەو پلــەو پایەیــەی گەیاندبوو، وە لە کۆتاییەکانی ژیانیدا داوای کردو فەرمووی( وەك خوای گــەورە دەفــەرموێت):

﴿ رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي

---

(٩) في رواية : أحمد (٣٣٣/٢) رقم (١٦٠٧٤) وقال محققه الأرناوؤط : إسناده صحيح ، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (١٢٤/١٠) رواه أحمد و إسناده حسن ، وحسن إسناده المنذري في ((الترغيب)) (٥٣٦) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب والترهيب)) (٣٦٨) ، و ((السلسلة الصحيحة)) (٢٥٩١).

(١٠) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (١٦٣/١) ، وابن ماجة في ((السنن)) (٣٩٢٥) ، ومالك في ((الموطأ)) (١٧٤/١) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣١٠) ، وصحح إسناده من طريق ابن خزيمة الشيخ شعيب الأرناوؤط في تحقيقيه لـ ((ابن حبان)) (٢٥٠/٧) وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣١٧٠) ، و((السلسلة الصحيحة )) (٦٥٤) ، و ((صحيح الترغيب)) (٣٦٩) .

(١١)اخرجه:أحمد في ((المسند)) (١٧٧/١) رقم (١٥٣٤) وقال محققة الأرناوؤط : إسناده قوى على شرط مسلم، والحاكم في ((المستدرك)) (٢٠٠/١) ، و صححه ووافقه الذهبي ، وابن خزيمة في ((الصحيح)) برقم (٣١٠) وقال محققه الشيخ الألباني: إسناده صحيح.

﴿ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾﴾ (يوسف: ١٠١) واته : ئه‌ی داهێنه‌ری زه‌وی و ئاسمانه‌كان تۆ پشت و په‌نامیت له دنیاو قیامه‌تدا بمرێنه به موسوڵمانی و بم گه‌یه‌نه به كاروانی پیاو چاكان ... وه‌هه‌روه‌ها دایكی به‌ڕێزی پێغه‌مبه‌ر عیسا (واته مریم) (عليها السلام) كاتێك كه تووشی منداڵ بوونه‌كه‌ی بوو فه‌رمووی: (وه‌ك خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت):﴿ فَأَجَآءَهَا ٱلْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ قَالَتْ يَٰلَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ﴿٢٣﴾﴾[١٢] (مريم: ٢٣)

واته : خۆزگه بمردمایه‌و تووشی ئه‌م منداڵ بوونه نه‌بوومایه چۆن وه‌ڵامی خه‌ڵك بده‌مه‌وه بڵێیم ئه‌مه له كوێوه بووه ، ... وه هه‌روه‌ها یه‌كێك له صه‌حابه‌كان (رضي الله عنه) ده‌فه‌رموێت : به‌یانیه كیان پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) دره‌نگ هات بۆ نوێژی به‌یانی ئه‌وه بوو دوایی به په‌له هات و نوێژی به‌یانی بۆ كردین ، و پاشان ووتمان: بۆ چی دوا كه‌وتیت ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ؟ فه‌رمووی: خوای گه‌وره‌م له خه‌ودا بینی ...هتد .... تا له كۆتایدا فه‌رمووی : خوای گه‌وره پێ ی فه‌رمووم ئه‌ی (محمد) داوا بكه، وه منیش داوام كرد و وتم: **((اللهم إنی أسألك فعل الخیرات وترك المنكرات... وإذا أردت فی قوم فتنة فتوفنی((إلیك منها)) غیر مفتون))**[١٣]. واته : (خوای گه‌وره داوات لێ ده‌كه‌م كه كاری چاكه بكه‌م و واز له خراپه‌كاری بێنم وه ئه‌گه‌ر كۆمه‌ڵه خه‌ڵكانێك بته‌وێ تووشی فیتنه‌و وه‌رگێڕانیان بكه‌یت گه‌ر من له ناویاندا بووم خوایه بمرێنیت و رزگارم بكه‌یت له‌و به‌ڵایه‌ی كه تووشی ئه‌وانی ده‌كه‌یت) ، به‌ڕاستی به‌ڵایه‌كی ترسناكه ئه‌ویش له ده‌ست دانی دین و ئیمانه ، وه ئه‌و به‌ڵاو ناڕه‌حه‌تیه گه‌وره‌یه‌ش له كۆتایی زه‌ماندا زۆر ده‌بێت...

ئه‌بو هوره‌یره (رضي الله عنه) ده‌فه‌رموێت : پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) فه‌رموویه‌تی : **((والذی نفسی بیده لا تذهب الدنیا حتی یمر الرجل علی القبر فیتمرغ علیه، ویقول یالیتنی كنت مكان صاحب هذا القبر ولیس به الدّین [مابه حب لقاء الله عز وجل ]**[١٤] **إلا البلاء))**[١٥] واته:

---

(١٢) انظر: حول الموضوع ((التذكرة في أحوال الموتى)) (١/ ٢٢) .

(١٣) أخرجه: أحمد في المسند (٥٣٠/٢) وقال محققه إسناده صحيح على شرط مسلم ، وصححه الشيخ الألباني في السلسلة الصحيحة (٥٧٨) .

(١٤) أخرجه :مسلم في الصحيح (٧٢٣١) ، وابن ماجة في (السنن) (٣٧) ، وصححة الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٢٦٢).

سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە ڕۆژی قیامەت نایەتە پێش تا پیاوێك بەلای گۆڕێکدا تێپەڕدەبێت و خۆزگە دەخوازێت ئەو لە جیاتی ئەوکەسە بوایە کە لەناو ئەو گۆڕەدایە لەبەر ئەوە نیە کەپێی خۆشە بگەڕێتەوە لای خوای گەورە بەڵکو تەنها لەبەر ئەو بەڵاو ناڕەحەتیانەی کۆتایی زەمانە ئاوات دەخوازێت بە براکەی کە مردووە ئەو لەجیاتی ئەو بوایە ]... وە هەروەها هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ـ لە کاتی خۆیدا ـ دیارە لە کاتی پێویستیدا داوای مردنیان کردووە وەکو(**عومەری کوڕی خطاب**) (رضي الله عنه) لە کۆتایی تەمەنیدا کە کاتێك ڕووبەری وڵاتی ئیسلامی گەورە بوو و خەڵکی موسوڵمان زۆر بوون وە (صحابە)کان بڵاوبوونەوە بە وڵاتاندا ئیمامی عومەر فەرمووی: (ئەی پەروەردگار بێهێزو لاواز بووم و تەمەنم درێژ بووە ژێر و دەستەکانم بڵاوەیان لێ کردووە خوایە ببەرەوە بۆ لای خۆت پێش ئەوەی کەم و کوڕی و ناڕەحەتیم بێتە ڕێ)(١٦). دەفەرموێت : دوا بە دوای ئەم داواکردنەی بەیەك مانگ خوای گەورە بردیەوە بۆ لای خۆی ، وە هەروەها ئیمامی عەلی (رضي الله عنه) لە شەڕی (**صفین**) دا بە حەسەنی کوڕی فەرموو : (ئەی حەسەن ئاواتە خواز بووم کە بمردمایە پێش بیست ساڵ لەمەوبەر)(١٧). لەڕیوایەتێکی تردا لە (عبدە) وە دەفەرموێت : گوێم لە عەلی بوو (خوای لێ ڕازی بێ) لەسەر منبەر وتاری دەدا و دەیووت : " خوایە من لەوان بێزار بووم ، وە ئەوانیش لە من بێزار بوون ، خوایە من لەوان بحەوێنەرەوە و ڕزگارم بکە ، وە ئەوانیش لە من بحەوێنەرەوە و ڕزگاریان بکە"(١٨).

وە هەروەها ئەبو سەلەمە (رضي الله عنه) دەفەرموێت : (چوینە لای ئەبو هریرە تەماشام کرد لەسەرەمەرگدایەو زۆر مردنی لەسەر ناڕەحەت بووە دەفەرموێت : باوەشم پیا کردوو ووتم:

---

(١٥) أخرجه مالك في : ((الموطأ)) (٢/٨٢٤) ، وابن أبي شيبة (٣/٨٧٢) وعبد الرزاق (٢٠٦٣٩) ، والحاكم (٣/٩١) ، وابن سعد (٣/٣٣٥)، و ابن حجر في ((المطالب العالية)) (٣٩٠١) ، وانظر ((التذكرة)) (١/٢٣) .

(١٦) أخرجه: ابن أبى الدنيا بإسناد صحيح كما قال الحافظ ابن حجر في ((الاصابة في تميز الصحابة)) (٤/٢٠٩) .و أخرجه: مالك (٢/٨٢٤) ، وأبونعيم رقم (١٤٨) ، و الحاكم (٣/٩٢) ، وأحمد (( الفضائل )) (٣٦١) ، وابن قدامة (( الرقة و البكاء)) (١٠٩) وقال محققه : اسناده صحيح.

(١٧) أخرجه: نعيم بن حماد ((الفتن)) (١٦٠) وقال محققه : إسناده حسن . وانظر:(المطالب العالية) (٩ / ٤٤) ، و ((كتاب المتمنين)) (٩٧) .

(١٨) أخرجه عبد الرزاق ((المصنف)) (١٨٦٠) ، وابن سعد ((الطبقات)) (٣/٣٤).

خوایە شیفای ئەبو هورەیرە بدەی ، ئەبو هورەیرە ووتی: ئەی پەروەردگار هەرگیزاو هەرگیز ئەبو هریرە نەگێڕیتەوە (دوو جار ئەمەی فەرموو) سوێند بەو خوایە ڕۆژگارێك دێتە پێش موسوڵمانان بەلای گۆڕێکدا تێدەپەڕن ئاواتە خوازن بەبراکەیان کە لە گۆڕەکەدایە...)[١٩]. وە عبد الله ی کوڕی مەسعودیش ئاواتی بە مردن دەخواست بۆ خۆی و خانەوادەکەی، پێی وترا : تۆ ئاواتی مردنت خواست بۆ خانەوادەکەت ، ئەی بۆ ئاواتی مردنت بۆ خۆت خواست ، ئەویش ووتی : " گەر بمزانیایە ئێوە وەك خۆتان دەمێننەوە و ناگۆڕێن ئەوجا ئاواتم بەژیان دەخواست"[٢٠]

وە هەروەها هاوەڵی بەڕێز عابسی غفاری (رضي الله عنه) ئاواتی بە مردن خواستووە بۆ ئەوەی تووشی ئەو ناڕەحەتیانە نەبێت کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی ڕاگەیاندووە کە دێت لە کۆتایی زەمانداو تا ئەو کە پێی نەگات ، لە ((علیم)) ەوە (رضي الله عنه) دەفەرموێت :

(لەگەڵ عابسی غەفاری دا بووم (رضي الله عنه) لە ماڵەکەی دا کە بینی خەڵکی لە تاعونی عەمواس لە شام کۆچ دەکەن و ماڵ دەپێچنەوە وە ڕادەکەن لە نەخۆشی تاعون ، تەماشای کردوو ووتی : ئەی تاعون وەرە بگەرە من ئەی تاعون وەرە بگەرە من (دوو جار) وە براکەی هەمان شێوە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بوو بە عابسی ووت : بۆ ئاواتی مردن دەخوازیت ؟ نازانیت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (ئاوات بە مردن مەخوازن) . ئەویش ووتی: ئەوەی تۆ گوێت لێ بووە منیش گوێم لێ بووە ، بەڵام من گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە کە دەیفەرموو : (پەلە بکەن بۆ مردن و کاری چاکە پێش بخەن پێش ئەوەی شەش شت بتان گاتێ و تووشی بن ئەوانەش)[٢١]. ((أمرة السفهاء وكثرة الشرط وقطيعة الرحم وبيع الحكم وإستخفافا بالدم ونشو يتخذون القرآن مزامير يقدمون الرجل ليس بأفقههم ولا أعلمهم ما يقدمونهم إلا

---

(١٩) أخرجه: ابن أبى الدنيا(( المحتضرين )) (٢٨٨) بإسناد صحيح كما قال الحافظ ابن حجر في (( الاصابة في تميز الصحابة)) (٢٠٩/٤) و وابونعيم ((الحلية)) (٣٨٤/١). وفي رواية اخرى عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال : (يوشك أن يكون الموت أحب إلى العلماء من الذهبة الحمراء ) .أخرجه : نعيم بن حماد ((الفتن)) (١٥٤) وقال محققه : اسناده جيّد.

(٢٠) انظر : ((شرح السنة)) للبغوي (٢٥٩/٥) ، ((كتاب المحتضرين)) لابن أبي الدنيا برقم (١٤٣) .

(٢١) أخرجه :أحمد في ((المسند)) رقم (٦٤٠) وقال محققه حديث صحيح ، والطبراني في ((المعجم الكبير))(٦١/١٨).

**لیغنیهم))** [٢٢] واتە: پێش ئەوەی هەرزەو بێ عەقڵەکان ببنە سەرۆك وکەسانی دەست و پەیوەندەکان زۆربن و پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێت و فەرمان ڕەوایی ببێتە کڕین و فرۆشتن کوشتن لای خەڵك ئاسان بێت و منالّ و مەزنێك بێنە ئاراوە قورئان بکەنە بالۆرە و گۆرانی یەکێکیان پێش دەخەن لەبەر ئەوە نیە کە لە هەموویان شارەزاترو تێگەیشتوو ترە بەڵکو بۆ ئەوەی قورئانەکەیان بۆ بکاتە گۆرانی و بۆیان بخوێنێت ، واتە پێش ئەوەی ئەو شەش شتە بگات پێتان ئاوات بە مردن بخوازن کەواتە ئاوات خواستن بە مردن لە هەندێك کاتدا قەدەغە کراوە تەنها لە کاتی پێویستدا نەبێت ناتوانین بڵێین چاکەیەو بە چاکە بۆ ئەو ئادەمیزادە دادەنرێت وەکو (ئیمامی نەوەوی) وە (ئیبن و حەجەر) وە (ابن کثیر) دەفەرموون: (**تدیناً**) واتە: لەبەر دینداری بێت ئنجا بەچاکە بۆی دەنووسرێت کە داوای مردن بکات.[٢٣]

## سوودی مردن ((فضل الموت))

پێش هەموو شتێك دەبێت بزانیت کە تۆ لە دنیادایت وە ئەو دنیایە هەمووی بێ کەڵکە وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: **((الدنیا ملعونة ملعون ما فیها إلا ذکر الله وما والاه أوعالماً أو متعلماً))**[٢٤] . واتە: دنیا نەفرینە وە ئەوەشی تیایدایە نەفرەت لێکراوە بێ کەڵکە تەنها یادی خوا نەبێت یان زانایەك زانیاری فێری خەڵکی بکات وە یاخود یەکێك فێری زانیاری شەرعی ببێت (واتە بۆ خوابێت و سوود بەخش بێت) ، کەواتە دنیا جێگەی حەوانەوەمانی لێ نیە، وە ئێمە ڕێبوارین وەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : **((ما لي وللدنیا ما أنا في الدنیا إلا کراکب إستضل تحت شجرة ثم راح وترکها))**[٢٥]. واتە: ( من لەکوێ و دنیا لەکوێ

(٢٢) أخرجه :أحمد في ((المسند)) (٣/٤٩٣) ، والطبراني في ((المعجم الکبیر)) (٣١٦٢) ، والحاکم في ((المستدرك)) (٣/٤٤٣) و صححه الشیخ الألباني في ((السلسلة الصحیحة)) رقم (٩٧٩). وفي روایة عن معاذ بن جبل (رضي الله عنه) قال : "إذا رأیتم الدم یُفسك بغیر حقه و المال یُعطي على الکذب ، وظهر الشك والتلاعُنُ وکانت الرِّدَّةُ فمن إستطاع أن یموتَ فلیَمُتْ " . أخرجه : نعیم بن حماد ((الفتن)) (١٥٨) وقال محققه : اسناده حسن.

(٢٣) أورده: ابن حجر ((فتح الباري)) (١٣/٧٥) ، و النووي في ((شرح مسلم)) (١٧/٧) وفي ((الاذکار)) (ص :٢٠٥)، و ابن کثیر في ((نهایة البدایة)) (١/٣٧) ، و صدیق حسن خان في ((الروضة الندیة)) (١/٤٣٦) .

(٢٤) أخرجه : ابن ماجة (١٤١٢) وحسنه الشیخ الألباني في ((المشکاة)) (٥١٧٦) ، و((صحیح ابن ماجة)) (٣٣٢٠) .

(٢٥) أخرجه : أحمد (١/٣٠٣) ، والترمذي (٢٣٧٨) ، وابن ماجة (٤١٠٩) ، وصححه الشیخ الألباني في ((الصحیحة)) (٤٣٩) ، و ((فقه السیرة)) (٤٧٨) ، و ((صحیح ابن ماجة)) (٣٣١٧) .

نموونەی من و نموونەی دنیا وەکو ئەسپ سوارێك وایە کە لەرۆژێکی هاویندا بەرێگەیەکی چوڵدا گوزەربکات و بگاتە ژێرسێبەری دارێك و لە ژێریدا کەمێك بحەوێتەوە وپاشان هەستێت و بڕوات) وەنموونەی دنیا وەکو ئەو دارەی سەر ڕێگایە وایە کە لە نارەحەتی گەرما ماوەی سەعاتێك پشووی لەژێردا دەدات پاشان بەجێ ی دەهێڵێت ، وە وێنەی بێ کەڵکی دنیا پێغەمبەر (ﷺ) بە نموونەی خواردنی مرۆف بۆمان دەهێنێتەوەو دەفەرموێت :((**إن مطعم ابن آدم ضرب للدنيا مثلاً بما خرج من ابن آدم وان قزحه وملحه فانظر ما يصير إليه**))[٢٦].

واتە: (خواردن و خواردنەوەی ئادەمیزاد ، نموونەی جوانی هێناوەتەوە بۆ ژیانی مرۆف لە دنیادا ئەگەر ئەو خواردنە بهێنێت وجوانی بکات و تەوابیل و بەهاراتی بەسەردا بکات و ڕێکی بخات بەڵام کۆتایی و پاشە ڕۆکەی چی دەبێت ژیانی دنیاش بەو شێوەیە).

(سەلمان) دەفەرموێت : کەسانێك هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وەلێی پرسین ئایا خواردنتان هەیە ؟ ووتیان : بەڵێ ، فەرمووی ئەی خواردنەوەتان هەیە ؟ ووتیان بەڵێ واتە: ((شیر و شتی تر...)) فەرمووی : (ئایا ساردی دەکەنەوە و ئامادەی دەکەن و دەیڕازێننەوە؟) ووتیان : بەڵێ ، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ((**فإن معادهما كمعاد الدنيا يقوم أحدكم إلى خلف بيته فيمسك على أنفه من نتنِه**))[٢٧]. واتە:(ئاگاداربن چارەنووسی ئەو خواردن و خواردنەوەیەش وەکو چارەنووسی ئەوەوایە کە دوابە دوای ئەوە یەکێکیان هەڵدەستێت و دەچێت لە پشت ماڵەکەی ڕۆی دەکات و دەستیش دەگرێت بە لووتی یەوەو بێزیی نایەت سەیرشی بکات) ... ئەوە ئەو خواردنە بوو چ حەڵاڵ چ حەرام کە هەموو دابەزینێکی لە پێناودا بۆ دەکەیت ... کەواتە دنیا ئەوەیەو بەرهەمەکەشی ئەوەیە کە تۆ دڵت پێ خۆشە ، وە (هەرکەسێك کە پێی خۆشە لە دنیادا یان ئاواتی ئەوە دەخوازێت و یادی ئەوە دەکات کە بژی و کامەرانی بە دەست بهێنێت باش بزانێت کە کامەرانی بۆ ئەو نی یە لەژیانی دنیادا وە کامەرانی هەموو دنیا لە چاو کامەرانی دوای مردن لە بەهەشتدا هەر هیچ نی یە)، وەکو

---

(٢٦) أخرجه : الطبراني ((الكبير)) (٢٥٣١) ، وأبو نعيم ((الحلية)) (٢٥٤/١) ، وابن حبان (٧٠٢) وقال محققه : حديث صحيح .

(٢٧) أخرجه : ابن مبارك ((زوائد الزهد)) (٤٩١) ، والطبراني ((الكبير)) (٦١١٩) ، وقال الشيخ شعيب الأرنؤوط في تحقيقه ((مسند الإمام أحمد)) (٢٥/٢٥) وفي تحقيقه ((صحيح ابن حبان)) (٤٧٧/٢) اسناده صحيح على شرط الشيخين .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ((مالدنيا في الآخرة إلا كمثل ما يجعل أحدكم أصبعة في اليَم فلينظر بم يرجع ))[٢٨]. واتە: (هەموو نیعمەتەکانی دنیا وەکو ئەوە وایە کە ئادەمیزادێک پەنجەیەکی بخاتە ناو ئاوێکی دەریاوە وە سەیری بکات کە چەند تنۆکە ئاوێکی لەگەڵ خۆی هێناوەتە دەر، ئەوەندە نیعمەت لە دنیا هەیە لەچاو قیامەتدا . کەواتە ئێرە نیعمەتی لێ نی یە بۆ تۆ لە چاو نیعمەتی نەبڕاوەی بەهەشت کە پێی بگەیت کە جێگەی یەکەم جاری باوەگەورەی تۆیە کە ئادەمە (علیه السلام) بۆیە هاتوویتە ئێرەوە بۆ ئەوەی دیسان بگەڕێیتەوە بۆ جێگە بنەڕەتیەکەی خۆت وە ئەو کەسانەی ژیانی دنیایان لا خۆشە با چاك بزانن کە ژیانی دنیا خۆشیەکانی ڕۆیشتووە و تاڵی و سوێریەکان ماوە وە ئەگەر پێی خۆش بێت بژی دەبێت ئەو تاڵی و سوێریەش بچێژێت وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ((لايأتي عليكم عام أو يوم الا الذي بعده شرّ منه ))[٢٩]. واتە : هەر ساڵێك یان هەر ڕۆژێك دێت ئەوەی دوای ئەو خراپتر دەبێت) وە مەعاویە(رضي الله عنه) دەفەرموێت : پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ((لم يبق من الدنيا الا بلاء وفتنة))[٣٠]. واتە: فیتنە نەبێت هیچ خۆشی و کامەرانیەکی تیا نەماوە) لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە خۆمان بە نامۆ بزانین و بە ڕێبوار بزانین چونکە ڕێگەی ئێمە ئێرەیە بەڵام ئامانج و مەبەست و شوێنی یەکجار ئێمە بەهەشتە ، وەك پێغەمبەر (ﷺ) (بە (إبن عمر)ی فەرموو: ((كن في الدنيا كأنك غريب أو عابرسبيل))[٣١]. واتە: (ژیان بەسەر بەرە لە دنیادا هەروەك ڕێبوارێك، ماوەیەك لەو شوێنە بەسەری دەبات ، و پاشان بە جێی دەهێڵێت).واتە مردن کە تۆ لێ ی دەترسی ئەو ترسناکەش نی یە چونکە لە دنیایەکی زۆر بچوکەوە دەچیتە دونیایەکی گەورەترەوە.

إبن القيم (رحمه الله) دەفەرموێت : (مرۆڤ چوار شوێنی هەیە تەسك ترین شوێنیان ناو سکی دایکە کە لە دایك بوو دێتە ناو دونیایی بەرینەوە دواجار دەمرێت دەچێتە ناو گۆڕەوە بۆ

(٢٨) أخرجه: مسلم (٢٨٥٨).

(٢٩) أخرجه: أحمد (١٢٣٤٧) واللفظ له ، والبخاري (٧٠٦٨).

(٣٠) أخرجه: أحمد (٩٤/٤) ، والطبراني ((الكبير)) (٩٦/٩) ، و ابن ماجة (٤٠٣٥)، وصححه اليشخ الألباني في ((صحيح ابن ماجة)) (٣٢٦٠).

(٣١) أخرجه: البخاري (٦٤١٦).

ژیانێکی ئێجگار گەورەتر لە ( ژیانی دنیا ) وە لە گۆڕیش هەڵدەسێت بەرەو قیامەت و دەچێتە ژیانێکی ئێجگار گەورەترەوە لە هەمووی)[٣٢].

عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە (رحمه الله) دەفەرموێت : (ئەی نەوەی ئادەمیزاد ئێوە دروست کراون بۆ ئەوەی بە هەتا هەتایی بژین ، مردن تەنها بۆ گوێزانەوەتانە لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر)[٣٣]

خوای گەورە مرۆڤەکان دەگوێزێتەوە لە نەبوونەوە بۆ ناو سکی دایك وە لەوێشەوە بەرەو دنیا وە لە دنیاشەوە بەرەو گۆڕ وە لەوێشەوە بەرەو بەهەشت ئەگەرشایستە بێت و ڕەحمی پێ ی بکات، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) بۆمان باس دەکات و ڕوونی دەکاتەوە کە گۆڕ خۆشترو باشترە لە ژیانی دنیا بۆ ئادەمیزاد : لە عەوفی کوڕی مالیکەوە (رضي الله عنه) دەفەرموێت: ( پێغەمبەرم (ﷺ) بینی لەسەر جەنازەیەك نوێژی دەکرد وەئەم دوعایەی دەکرد : ((اللهم إغفر له وارحمه...وأكرم ُنزله ...و وسع مدخله...وأبدله داراً خيراً من دارهِ وأهلاً خيرا ًمن أهله ...وزوجاً خيراً من زوجهِ))[٣٤] واتە : خوایە لێ ی خۆش ببەو ڕەحمی پێ بکە ... تاگەیشتە ئەوەی فەرمووی خوایە جێگەیەکی وای پێ ببەخشە(لەناو گۆڕەکەیدا) چاکتربێت لە جێگەی پێشووی خوای گەورە فەرمان دەکات کە بەندە خاوەن باوەڕەکەی دەرگای بەهەشتی بۆ بکرێتە سەر گۆڕەکەی ئەوەتا لە خانووەکەی دونیایەوە گوازراوەتەوەو لە ڕێگەی مردنەوە و گەیشتوەتە شوێنێکی نزیك بەهەشت ، وە پۆشاکی بەهەشتی بەبەردا کراوە ، مردنیش گەڕانەوەیە بۆلای خوا وەکو خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ .....كُلٌّ إِلَيْنَا رَاجِعُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾ (الأنبياء: ٩٣). واتە: هەمووتان بۆ لای ئێمەدەگەڕێنەوە. کەواتە مردنمان پێ خۆشە چونکە گەڕانەوەمانە بۆ لای خوا وەکو دەفەرموێت: ﴿ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمَسَاقُ ﴿٣٠﴾ ﴾ (القيامة: ٣٠) واتە: ڕەوانە دەکرێت بۆلای خوای گەورە ، ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) لە سەرە مەرگدا وەسیەتی بۆ ئەو هاوەڵانی کرد کە لە چوار

(٣٢) انظر: ((الروح)) لابن قيم (ص: ١١٦).

(٣٣) أخرجه : أبو نعيم في ((حلية الأولياء)) (٥/٢٨٧) ، والبيهقي في ((الزهد)) (٥٣٧) عن بلال بن سعد وقال محققه : رجاله ثقات.

(٣٤) أخرجه : مسلم في الصحيح (٢٢٢٩)، والنسائي في ((السنن)) (١/٢٧١) وابن ماجة في ((السنن)) (١٥٠٠) ، والبيهقي في ((السنن الكبرى)) (٤/٤٠).

دەوری بوون و فەرمووی: ((لا تضربوا علي فسطاطاً ولا تتبعوني بمجمر وأسرعوا بي إلى ربي...))[٣٥]. واتە : کە پر نەکن بەسەر جەنازەکەمەوە ، وە چراو مۆمیش لە دوای جەنازەکەمەوە هەڵنەگرن زوو بم گەیننە لای خوای خۆم (تبارك وتعالى)...

وە هەروەها لە ئەبو دەردائەوە (رضي الله عنه) دەفەرمویت : ((أحبُ الفقر تواضعاً لِرَبی وأُحِبُ الموت أشتياقاً لِرَبی)) [٣٦]. واتە : هەژاریم پێ خۆشە چونکە مل کەچی تیایە بۆ خوای خۆم وە مردنیشم پێ خۆشە چونکە موشتاقی لای خوای خۆمم .

وە هەروەها ئیبن و مەسعود(رضي الله عنه) دەفەرمویت : ((ليس للمؤمن راحة دون لقاء الله))[٣٧].واتە: (موسوڵمان هیچ پشوویەکی نی یە تەنها گەیشتن بە خوای خۆی نەبێت) وە دیسان دەفەرمویت : (( حبذا المكروهان : الموت و الفقر))[٣٨] واتە: خۆزگە دەخوازم بە دوو شتە ناخۆشەکە: مردن و هەژاری، وە هەروەها ابن مسعود (رضي الله عنه) دەفەرمویت : ((انه سيأتي عليكم زمان لو وجد فيه احدكم الموت يباع لإشتراه)) [٣٩]واتە : زەمانێك دێت هەریەکێك لە ئێوە گەر مردن ببینێت بفرۆشرێت ئەو دەیکرێت ، وە هەروەها تابیعی بەڕێز ابو سلمەی کوڕی عبدوالرحمن دەفەرمویت : ((ان استطعت ان تموت فمت فوالله ليأتين على الناس زمان يكون الموت أحب إلى احدهم من الذهب الأحمر))[٤٠] . واتە : ئەگەر دەتوانیت بمریت ئەوا بمرە سوێند بەخوا زەمانێك دێت بەسەر خەڵکاندا کە مردن لای یەکێکیان خۆشەویستر دەبێت لە ئاڵتوونی سور . کەوابوو ژیان ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو ناهەموارتر دەڕوات بۆیە لەئاخر زەماندا ئاوات

---

(٣٥) أخرجه : أحمد في المسند : (٢٩٢/٢) ، وصحح إسناده الحافظ في ((الاصابه)) (٢٠٩/٤) ، وقال الشيخ الألباني في ((أحكام الجنائز)) (ص: ٩٣) : إسناده صحيح على شرط مسلم.

(٣٦) أخرجه : البيهقي في ((شعب الإيمان)) (١٠٠٨٢) ، وأبونعيم ((الحلية)) (٢١٧/١) .

(٣٧) أخرجه أحمد في (الزهد) (١٥٦) ، و أبو نعيم في ((حلية الأولياء)) (١٣٦/١)، و صحح إسناده الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١١٦/٢).

(٣٨) أخرجه: ابن المبارك في ((الزهد)) (٥٢١) ، وقال محققه : إسناده حسن ، هناد في ((الزهد)) (٦٠٣) وقال محققه: اسناده حسن

(٣٩) اخرجه : ابو عمر و الداني في : ((السنن الواردة في الفتن)) (١٨١) .

(٤٠) اخرجه : عبدالرزاق في ((المصنف))(٢٠٧٣٤) ، و ابو عمرو الداني في ((السنن الواردة في الفتن)) (١٧٩)، والحاكم في ((المستدرك)) (٥١٨/٤)، و صححه و وافقه الذهبي .

خواستن بەمردن و خۆش ویستنی مردن زیاد دەبێت ، لەگەڵ ئەوەشدا کەدونیا وەك بەندیخانەیەك وایە کە ئێمە ژیانی تیادا بەسەر دەبەین وەکو پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێت : ((الدنیا سجن المؤمن وجنة الكافر)) (٤١). واتە: دنیا بەندینخانەی باوەڕدارە وە بەهەشتی بێ بڕوایە ، بێ گومان هەرکەس لە بەندیخانە دەربچێت پێی خۆش نی یە بگەڕێتەوە ناوی .

وە ئیمامی مسروق دەفەرموێت (( ما من بيت خيرٌ للمؤمن من لحد قد إستراح فيه من هموم الدنيا وأمن مِن عذاب الله ))(٤٢) واتە: بڕوادار هیچ خانووەیەك نیە چاکتر بێت بۆی وەك ناو گۆڕ کە تیایدا دەحەوێتەوە و ڕزگاری دەبێت لە مەینەتیەکانی دونیا و دوور دەبێت لە سزای خوا .

وە لە عوبادەی کوڕی صامتەوە (رضي الله عنه) دەفەرموێت :- پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ((ما على الأرض من نفس تموت ، ولها عند الله خير تحب أن ترجع إليكم ولها الدينا ، ((وعشر أمثالها)) (٤٣) إلآ ((الشهيد)) فإنه يحب أن يرجع الى الدنيا فيقتل عشر مرات لما يرى من الفضل)) (٤٤) واتە : هیچ نەفسێك نیە لەسەر ڕووی زەویدا کە دەمرێت پێ ی خۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ دونیا ، گەر دنیاو دە ئەوەندەی دنیای پێ بدەن ڕازی نابێت و پێی خۆش نی یە دیسان بگەڕێتەوە (چونکە پڕە لە نارەحەتی و نەهامەتی و بەلاو موسیبەت ) تەنها شەهید

---

(٤١) أخرجه مسلم في((الصحيح)) (٧٣٤٣) ، وقال عبد الله بن عمرو بن عاص (رضي الله عنه) : (( مثل المؤمن حين يخرج نفسه مثل رجلٍ كان في سجنٍ فاخرج منه فهو يتفسح في الأرض ويتقلبُ فيها ...)) أخرجه :ابن أبي الدنيا ((ذم الدنيا)) (١٠٨) ، ابن المارك ((الزهد )) (٥٥٢) وقال محققه: اسناده حسن . وفي رواية أخرى عنه مرفوعاً: (( الدنيا سجن المؤمن و سنتهُ فاذا فارق الدنيا فارق السجن والسنة)) أخرجه: ابن أبي الدنيا ((ذم الدنيا)) (١٠٧) ، و الحاكم (٣١٠/٤) وصححه ووافقه الذهبي.

(٤٢) أخرجه: ابن أبي شيبة ((المصنف )) (١٤٨/٧) ، وأحمد ((الذهد)) (ص: ٣٥٠) ، وابن عساكر ((تأريخ بعداد ) (٢١٦/١٦) ، و وكيع ((الزهد)) (٣١٣/٢) ، وابن ابي الدنيا ((كتاب القبور)) (١٤١) وقال محققه : إسناده صحيح .

(٤٣) في رواية أحمد المسند رقم (١٤٠٨٣) وقال محققه الشيخ الأرناوؤط :إسناده صحيح على شرطهما ، وابن حبان في ((الصحيح)): : (٧٤٥٢) وقال محققه : إسناده صحيح على شرط الشيخين .

(٤٤) أخرجه: أحمد في :((المسند)) (٣١٨/٥) رقم (١٤٠٣٣) وقال محققه الأرناوؤط : إسناده صحيح على شرط مسلم، والنسائي في ((السنن)): (٣٥/٦)، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٢٢٨)، و في صحيح ((الجامع)) (٥٦٣٨).ويقول الله تعالى:﴿ ....وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٥١﴾ ﴾ (البقرة: ٢٥١).

نەبێت کە حەز دەکات دە جاریش بگەڕێتەوە بۆ دنیا بۆ ئەوەی دەجار شەهید بێت چونکە دەزانێت پلەو پایەی شەهید لای خوای گەورە چەندە) ، کەواتە مردن پشوودانە بۆ خاوەن باوەڕ لە دوو ڕوووەوە : (یەکەم) کە مردووە ، (دووەم) کە ڕزگاری بووە لە ناخۆشی و نارەحەتی و بەڵای دونیا. وەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویێت: ((المؤمن يموت و يستريحُ من أوصاب الدنيا و بلائها و مصيباتها [ وأذاها ] إلى رحمه الله ))[٤٥] واتە:(موسوڵمان کە دەمرێت پشوو دەدات و ڕزگاری دەبێت لە هەموو مەینەتی ونارەحەتی و ئازارەکانی ژیانی دنیا (بۆلای ڕەحمەتی خوای گەورە) بەڵام کافر گەر بمرێت مردن چاکترە بۆی چونکە وولات و خەڵکان و درەختەکان و گیان لەبەران خۆش حاڵ و کامەرانن کە ئەو کافرەیان لێ دوور خراوەتەوە)[٤٦] .کەواتە مردن چاکترە بۆ ئادەمیزاد چونکە ئەگەر زیاتر بژی لەوە دەچێ زیاتر تووشی بەڵاو تنگەژە ببێت بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویێت : ((اثنان يكرههما ابن ادم :يكرهُ الموت والموت خير لهُ من الفتنة ويكرهُ قلة المال وقلة المال أقل للحساب....))[٤٧].واتە : ئادەمیزاد دوو شتی پێ ناخۆشە .

**یەکەم :** مردنی پێ ناخۆشە و حەزی پێ ناکات بەڵام مردن باشترە بۆی لە توش بوون بە پاشەگەزبوونەوە لە بڕواداری .

**دووەم:** پێ ی ناخۆشە پارە کەم بێت بەڵام ئەوە قازانجە بۆی چونکە لێپرسینەوەی سووك دەبێت، واتە : گەر دە دیناری لابێت لێ پرسینەوەی سووکترە لەوەی لەسەر هەزار دینار لێ پرسینەوەی لە گەڵدا بکرێت . وە ئەوەش بزانە ئەو پارەو سامان و ماڵەش کە لای تۆیە هەمووی موڵکی خوایە وە لێپرسراویت لە پەیدا کردنی وە بە ویستی تۆش نی یە چۆن سەرف کردنی .

---

(٤٥)أخرجه: أحمد في ((المسند)) : (٢٩٦/٥) ، والبخاري في ((الصحيح)) : (٦٥١٢) ، ومسلم : ((الصحيح)) (٩٥٠)، والنسائي في ((السنن)) (٤٨/٤)، وابن حبان في: ((الصحيح)) (٣٠٠٧) ، (٣٠١٢) وقال محققه : إسناده صحيح واللفظ له و انظر : ((المسند المستخرج)) (٢١٢٨).

(٤٦) نفس المصدر.

(٤٧) أخرجه: أحمد : في (المسند) (٤٢٧/٥) ، وصحح إسناده السيوطي في (شرح الصدور) (ص : ١٣) ، وصححه ايضا الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٨١٣) وفي ((صحيح الجامع) ( ١٣٩).

(ئیبن مەسعود) (رضي الله عنه) دەفەرموێت : ((ما من نفس برة ولا فاجرة إلآ والموت خير لها من الحياة إن كان براً فقد قال تعالى ﴿ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ ١٩٨ ﴾ (٤٨) وإن كان فاجرة فقد قال الله تعالى ﴿ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ خَيۡرٞ لِّأَنفُسِهِمۡۚ إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ١٧٨ ﴾(٤٩))) (٥٠) واتە: مردن زۆر چاکە بۆ هەردوو لا بۆ موسوڵمان وە بۆ کافریش ، هەر بەندەیەك چاك بێت لای خوا ، یان خراپ بێت هەر مردن بۆی چاکترە لە ژیان ، ئەگەر خاوەن باوەڕبێت ئەوا ئەوەی لای خوایە زۆر چاکترە بۆ ئەو چاکە خوازانە لە وەی لە دنیادا هەیە وە ئەگەر خراپە کاریش بێت هەر مردن بۆی چاکترە وەکو خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ .... إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ١٧٨ ﴾ (آل عمران: ١٧٨) واتە: بواریان دەدەین تا تاوان زیاتر بکەن بۆیە هەرگیز خەیاڵیان وا نەبێت ئەوانەی کە خراپە دەکەن و دەست بەجێ خوای گەورە تۆڵەیان لێ ناسەنێت کە خوا خێری دەوێت بۆیان ، نەخێر خوای گەورە دەست بەجێ تۆڵەیان لێ ناسەنێت بۆ ئەوەی تاوانیان زیاتر لەسەر کەڵەکە بێت تا سزای سەختیان زیاتربێت . کەواتە: ( گەر زووتر بمرێت سزای سووکترە لە دۆزەخدا وە گەر درەنگیش بمرێت دیارە سزای قورسترە)

عەبدوڵای کوڕی مسعود(رضي الله عنه) دەفەرموێت : (( أمس خيرٌ من اليوم ، و اليوم خيرٌ من غد، و كذلك حتى تقوم الساعة ))(٥١) واتە: دوێنێ چاکتر بوو لەئەمڕۆ ، وە ئەمڕۆش چاکترە لە سبەینێ ، وە ڕۆژگاریش بەم جۆرە دەبێت هەتا هاتنی قیامەت و تەواو بوونی دونیا.

---

(٤٨) آل عمران: (١٩٨)

(٤٩) آل عمران: (١٧٨)

(٥٠) أخرجه: الطبرى في التفسير :(١٨٧/٤) ، وابن أبى شيبة في المصنف :(٣٠٣/١٣) ، والطبراني في : ((المعجم الكبير)) (٨٧٥٩) ، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (٣٠٩/١٠) رواه الطبراني بإسنادين ورجال أحدهما صحيح غير يزيد بن أبى زياد وهو حسن الحديث ، والحاكم ( ٢/ ٢٩٨) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي.وقال: محققه:((المستدرك)) (٣٢٢٢):وهو صحيح.

(٥١) أخرجه: الطبراني ((الكبير)) (٨٧٧٣) ، وقال الهيثمي في ((المجمع)) (٢٨٦/٧) رجاله رجال الصحيح ، وقال صديق حسن خان في ((الأذاعة)) (ص: ٣٦): اسناده صحيح.

وه هەروەها دەفەرموێت : (( **ذهبوا صفو الدنيا فلم يبق الا الكدر فالموت اليوم تُحفةٌ لكل مسلم** ))[٥٢] واته: خۆشی دونیا ڕۆیشت و تەواو بوو ، تەنها لێڵی و نارەحەتیەکەی ماوه ، کەواته مردن ئەمڕۆ خەلأته و دیاریه بۆ هەموو موسوڵمانێك .

وه ئەبو سەلمەی کوڕی عبد الرحمن دەفەرموێت : (( **لیأتين على الناس زمان يكون الموت أحب إلى أحدهم من الذهب الأحمر** ))[٥٣] .واته: خەڵکان کاتێکیان بەسەردا دێت مردنیان لا خۆشەویستر دەبێت له ئالتونی سور.

## یادی مردن و خۆ ئامادەکردن بۆ مردن

پێویسته لەسەر موسوڵمان هەمیشه مردنی له یادبێت وه هەرگیز ئەو یاده لێی جیا نەبێتەوه چونکه نیشانەی ووشیاری و عەقڵ و زیرەکی یه، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:- له ئیبن و عومەرەوه (رضي الله عنه): (( **أفضل المؤمنين أحسنهم خلقا ، وأكيسهم أكثرهم للموت ذكرا ، و أحسنهم ((لما بعده)) إستعدادا ، أولئك الأكياس [ذهبوا بشرف الدنيا و كرامة الآخرة ]** [٥٤]))[٥٥] واته: باشترینی موسوڵمانان ئەوانەن که جوانترین خوڕەوشتیان هەیه و ووشیارترین و ژیرترین موسوڵمانان ئەوانەن که لەهەموویان زیاتر یادی مردن دەکەنەوه وه له هەموویان چاکتر خۆیان ئاماده کردووه بۆ دوای مردن ، بەڕاستی ئەوانه ژیرن سەروەری دنیاو ڕێزی کۆتاییان به دەست هێناوه. کەواته یادی مردن هاندەره بۆ موسوڵمان که زیاتر تەرازووەکەی لای خوای قورس تر بکات وه چاکەو پله بەرزی موسوڵمان وەکو پێغەمبەر (ﷺ) ڕوونی کردەوه به زیاتر بیرکردنەوەیەتی له مردن.

له سەهلی کوری سەعدەوه (رضي الله عنه) دەفەرموێت : (پیاوێك له هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) له ناو هاوەڵەکاندا باسکرا ،وه هاوەڵەکان هەر یەکه به جۆرێك باسی ئەو هاوەڵەیان کرد به

(٥٢) أخرجه: الطبراني ((الكبير)) (٨٧٧٤) ، وعبد الرزاق (((المصنف)) (٢٠٨٩٠).

(٥٣ ) اخرجه: عبد الرزاق ((المصنف )) (٢٠٧٣٤) ، و الحاكم في (( المستدرك)) (٥١٨/٤) وصححه ووافقه الذهبي.

(٥٤) في رواية :الطبراني في ((الصغير))(١٨٠/١) وإسنادهُ حسن كما قال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (٣٠٩/١٠) .

(٥٥) أخرجه : ابن ماجة في ((السنن))(٤٢٥٩)، والبيهقي في ((شعب الإيمان)) (٧٩٩٣)، وحسنهُ الشيخ الألباني ((السلسلة الصحيحة)) (١٣٨٤) ، وفي صحيح ((سنن ابن ماجة)) (٣٤٣٥).

چاکە کە هەموو سیفەتەکانیان باس کرد و بێ دەنگ بوون، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی کردە هاوەڵەکانی و فەرمووی : ((هل كان يكثرذكر الموت ؟)).. واتە : ئەو هاوەڵەی کە ئێوە باسی دەکەن ئاوا بوو ئایا زووزوو یادی مردنی دەکرد ؟ ووتیان نەخێر، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ((فهل كان يدع كثيرا مما يشتهي ؟)) واتە : ئایا وازی لە زۆربەی ئارەزووەکانی دەهێنا ؟ ووتیان : نەخێر ، فەرمووی: (هاوەڵەکەتان نەگەیشتۆتە ئەو پلە و وەسفەی کە ئێوە باسی دەکەن) [٥٦].دایکی ئیماندارن عائیشە ( رضي الله عنها ) دەفەرموێت " أكثر الموت يرق قلبك".[٥٧] واتە : زۆر یادی مردن بکە دڵت نەرم دەبێت وە (محمدی کوڕی سیرین) هەرکات یادی مردنی بکردایە وەك مردووی لێ دەهات[٥٨].

وەزۆر یاد کردنی مردن سودو قازانجی زۆری تیایە بۆ خاوەن باوەڕ چ بۆ هەژارو چ بۆ دەوڵەمەند... لە ئەبو هورەیرە(رضي الله عنه) وە دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((أكثروا ذكر هادم اللذات الموت فما ذكره عبدقط وهو فی ضيق إلا وسعه عليه ولا ذكره وهو فی سعةٍ الا ضيقهُ عليه))[٥٩] . واتە : ( زۆر بیری مردن بکەن کە ڕووخێنەری خۆشیەکانە چونکە هەرکەسێك لە ناڕەحەتی و هەژاری و نەبوونیدا بیری مردن بکات ئەو هەموو خەم و خەفەتەی دەڕەوێنێتەوە ، وە گەر لە دەوڵەمەندی و لەش ساغی و بوغرایدا بووبێت و خوای لە بیر چووبێتەوە بەس تەنها بە بیر کردنەوە لە مردن ئەوانەی لە پێش چاو سووك وبێ نرخ دەکات ). ئەبودەردا (رضي الله عنه) دەفەرموێت:(( من أكثر ذكر الموت قل حسده وقل فرحه))[٦٠] واتە: هەر کەسێك زۆریادی مردن بکات حەسودی وە دڵخۆشی بە دونیاکەم دەبێت.

---

(٥٦) أخرجه: الطبراني في ((المعجم الكبير)) (١٨٥/٦)، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (٣٠٩/١٠): إسناده حسن ، وكذا قال المنذري في (الترغيب) (٤٨٨٧) ، وضعفه والشيخ الألباني في (( ضعيف الترغيب )) (١٩٤٧) وأوردته للعلم فقط.

(٥٧) أخرجه: ابن أبي الدنيا ((ذكر الموت )) (١٥٦).

(٥٨) أخرجه: أحمد ((الزهد)) (٢٨٠/٢) ، وأبونعيم ((الحلية)) (٢٧٢/٢) ، وابن أبي الدنيا ((اصطناع المعروف)) (٣٧) ، والذهبي في ((سيرة الأعلام )) (٦١٠/٣).

(٥٩) أخرجه: القضاعي ((مسند الشهاب)) (٦٦٨) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٢٩٩٣) وقال محققه: إسناده حسن.

(٦٠) أخرجه: أحمد (( الزهد)) (ص: ١٤١) ، وابن ابي الدنيا (( ذكر الموت)) (٣٦٠) ، وابن عساكر (١٩٤/٤٧)، والبغوي ((شرح السنة)) (١٤٤٧) ، والأصبهاني في (( سير السلف )) (٥٦٠/٢)، و الذهبي (( سير أعلام النبلاء)) (٣٥٣/٢)، وعن الأوزاعي قال :" من أكثر ذكر الموت كفاه اليسير" . أخرجه: البيهقي ((الزهد)) (٥٩٤) وقال محققه : رجاله

**وه ئیمامی عه‌لی** (رضي الله عنه) ده‌فه‌رموێت : (( **من زهد في الدنيا هانت عليه المصيبات ، ومِن إرتقبَ الموت سارع إلى الخيرات** ))[٦١] . واته: هه‌ر كه‌سێك دونیا نه‌ویست بێت به‌لاكانی له‌سه‌ر سووك ده‌بێت ، وه هه‌ر كه‌سێك مردن به‌نزیك بزانیت په‌له ده‌كات بۆ ئه‌نجامدانی كاره چاكه‌كان.

**حه‌سه‌نی به‌صری** (رحمه الله) ده‌فه‌رموێت : " **ماألزم عبد قلبه ذكر الموت الاّ صغرّتْ الدنيا عنده و هان عليه جميع ما فيها** "[٦٢] واته: هه‌ر كه‌سێك به‌رده‌وام یادی مردن له دڵی خویدا بكات دونیای لابچووك ده‌بێت و هه‌موو شتانی دونیای لابێ نرخ ده‌بێت.

تابعی به‌ڕێز ( **الربيع بن هيثم** ) ده‌فه‌رموێت: " **أكثروا ذكر هذا الموت الذي لم تذوقوا قبله مثله ،فان الغائب إذا طالت غيبته ، وجبت محبته وانتظره اهله واوشك ان يقدم عليه**"[٦٣] واته: زۆر یادی ئه‌و مردنه بكه‌ن كه له‌مه‌و پێش شتی واتان نه‌چه‌یشتوه چونكه باس كردنی خۆشه‌ویستێكی دوور و زۆرچاوه‌ڕوان كردنی ، زیاتر خۆشه‌ویستی ده‌كات و زیاتر به‌یه‌ك گه‌یشتنی نزیك ده‌كاته‌وه.

**ئه‌بو فه‌رجی ی جوزی** له (منهاج القاصدين)دا ده‌فه‌رموێت :" **كثرة ذكر الموت يوجب كراهية الحياة وحب الموت يبعد صاحبه عن الوهن – كما قيل للنبيّ** (صلى الله عليه وسلم) **ما الوهن ؟ قال (( حبُ الدنيا و كراهية الموت))**[٦٤] . واته: زۆر یادكردنی مردن ڕق لێ بوونی ژیانی دونیا مسۆگه‌ر ده‌كات و خاوه‌نه‌كه‌ی له لاوازی باوه‌ڕ دوورده‌خاته‌وه . وه‌ك له پێغه‌مبه‌ریان پرسی (صلى الله عليه وسلم) (الوهن) چیه؟ له‌وه‌لامدا فه‌رمووی : (( خۆشه‌ویستی دونیاو پێناخۆش بوونی مردنه))[٦٥].

---

ثقات. ، وهو مروي أيضاً من قول عمر بن العزيز: (( من أكثر ذكر الموت رضي من الدنيا باليسير)) أخرجه: ابن عساكر (٢٠٤/٤٥) ، وابن أبي الدنيا (( ذكر الموت)) (٣٧).

(٦١) أخرجه: ابن أبي الدنيا في (( ذكر الموت )) (١٣١) ، وفي (( ذم الدنيا )) (٢٠٤) ، والبيهقي في (( الشعب الأيمان )) (١٠٦٢٤).

(٦٢) أخرجه: ابن أبي الدنيا (( ذكر الموت )) (١٢٩).

(٦٣) اخرجه: أبو نعيم (( الحلية)) (١١٢/٢) ، و الأصبهاني (( سير السلف )) (٧٦٣/٣).

(٦٤) اخرجه: الطبراني ((الكبير)) (١٤٥٢) ، و أحمد (٢٢٣٩٧) وقال محققه : اسناده حسن .

(٦٥) انظر: ((مختصر منهاج القاصدين)) (ص: ٤٠٢).

هەروەها ( **ابن رجب** ) دەفەرموێت : " زۆر یادکردن و باس کردنی مردن سوودی زۆرە لەوانە: باش خۆ ئامادەکردن بۆ مردن ، و کەم کردنەوەی هیوای تەمەن درێژی ، و ڕازی بوون بەڕزق ودارای کەم ، و نەویستنی دونیا ، و هەوڵدان بۆ قیامەت ، و بەکەم زانینی نارەحەتیەکانی دونیا ، و خۆ دوورگرتن لە فیزو لە خۆبای بوون و وێڵ بوون بە دوای خۆشیەکانی دونیا" (٦٦). کەواتە مردن پەندی ئادەمیزاد دادەدات کە خۆی بۆ قیامەت ئامادە بکات وە پێغەمبەر (ﷺ) داوای لێکردووین کە زۆر یادی مردن بکەین وەهەندێك ڕێگەی نیشان داوین کە ئەنجامی بدەین تا هاندەر بێت بۆمان بۆئەوەی یادی مردن زیاتر بکەین :

**یەکەم** : پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانمان پێ دەکات و داوامان لێ دەکات کە زوو زوو سەردانی گۆڕستان بکەین وەك دەفەرموێت : لە بورەیدەوە(رضي الله عنه) ((**قد كنت نهيتكم عن زيارة القبور...ألا فزوروها فإنها (تذكركم) الأخرة**))(٦٧).واتە : من پێشتر قەدەغەم کردبوو لێتان کە بچن سەردانی گۆڕستان بکەن بەڵام ئێستا بچن سەردانی بکەن چونکە ڕۆژی دواییتان بە بیر دێنێتەوە . لەڕیوایەتێکی تردا ...((**إنها ترق القلب وتدمع العين وتذكر الاخرة فزوروها ولا تقولوا هجراً**))(٦٨). واتە : سەردانی گۆڕستان بکەن چونکە دڵ نەرم دەکات وە فرمێسك دێنێتە خوار لە چاو، وە ڕۆژی کۆتاییتان بەبیر دێنێتەوە، وە سەردانی گۆڕستان بکەن و قسەی خراپ لە دەمتان نەیەتە دەر . وە لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((**...فإنها تذكركم الموت**)) (٦٩). واتە: سەردانی گۆڕستان بکەن چونکە مردنتان بیردێنێتەوە.لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : (( **فزوروها فان في زيارتها عِظةٌ وعبرةٌ**))(٧٠).

---

(٦٦) انظر : (( لطائف المعارف)) (ص: ١٤٢).

(٦٧) أخرجه : مسلم في (الصحيح) (٩٧٧) ، والترمذي في ((السنن)) (١٠٥٤) ،و أبو داود في ((السنن)) (٣٢٣٥) ، والنسائي في ((السنن)) (٩٨/٤)، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٨٨٦) وفي ((صحيح سنن الترمذي )) (٨٤٢).

(٦٨) أخرجه :أحمد في ((المسند)) (١٣٤٨٧) وقال محققة الشيخ الأرناؤوط صحيح بطرقة ،والحاكم في ((المستدرك)) (٣٧٦/١)، وحسن إسناده الشيخ الألباني في ((أحكام الجنائز)) (ص :٢٢٨ ).

(٦٩) أخرجه : مسلم في : ((الصحيح))(٢٢٥٦)، و ابن ماجة في ((السنن))(١٥٧٢)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (١٢٧٧)، و في ((الإرواء)) (٧٧٢) و اللفظ لابن ماجة.

(٧٠) اخرجه: أحمد ((المسند)) (٢٣٠١٥) وقال محققه : حديث صحيح .

واتە: سەردانی گۆڕستان بکەن چونکە سەردان کردنی پەند و ئامۆژگاریە بۆ ئادەمیزاد. بۆیە پێویستە هەموو کات مردنمان لەپێش چاوبێت ، یەکێك لە تابیعیەکان کەناوی (النضر بن المنذر)ە دەفەرموێت: " زوروا القبور في كل يوم بقلوبكم ، وشاهدوا الموت بتوهمكم وتوسدوا القبور بفكركم واعلموا أن ذلك لامحالة "[٧١].واتە: هەموو ڕۆژ سەردانی گۆڕستان بکەن بەدڵتان، وە مردن بهێنە پێش چاوتان ، وە پاڵ کەوتنی ناو گۆڕ بهێننەوە بیرتان ، وە دڵنیابن ئەوە هەر دێتە ڕێتان.

**دووەم** : سەردانی ئەوانە بکەن کەوان لە ڕێگەی گۆڕستاندا واتە ناخۆشی سەرەمەرگ . وەك ئیمامی علی (رضي الله عنه) دەفەرموێت : (( **ابلغ العظات النظر إلى الأموات**))[٧٢]. واتە : کاریگەر ترین ئامۆژگاریەکان تە ماشاکردنی مردووەکانە .

**سێیەم**: شوێن کەوتنی جەنازە بۆ گۆڕستان وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :- لە ئەبو سەعیدی خودری(رضي الله عنه) ((**عودوا المريض واتبعوا الجنائز تذكركم الاخرة – وفي رواية– : [فانها تذكركم الموت]**))[٧٣]. واتە: زوو زوو سەردانی نەخۆش بکەن وە بەدوای جەنازەدا بڕۆن چونکە مردنتان بیردێنێتەوە. بۆیە ابن قيم لە (الجواب الكافي: ٦٨ )دا دەفەرموێت:

( **المرض بريد الموت**) واتە: نەخۆشی پۆستەی مردنە.

کەواتە ئادەمیزادی خاوەن باوەڕ دەبێت هەرگیز لەیادی مردندا بێت هەتا لە ناو نوێژیشدا هەموو خەیاڵێکی لێ قەدەغەیە تەنها یەك خەیاڵ نەبێت ئەویش خەیاڵی مردنە.وەك پێغەمبەر دەفەرموێت: ((**... اذكر الموت فی صلاتك فإن الرجل إذا ذكر الموت فی صلاته لحریّ أن يحسن صلاته ، وصلِّ صلاة رجل لا يظن أنه يصلي صلاةً غيرها ...**))[٧٤]. واتە: لە نوێژەکانتدا یادی مردن بکە چونکە هەرکەس لە نوێژەکەیدا یادی مردن بکات ئەوا دەبێتە

---

(٧١) أخرجه: أبو الشيخ (العظمة)) (٢٥٠/١) ، ابن أبي الدنيا ((ذكر الموت)) (١٥٤) ، و أبو نعيم ((الحلية)) (١٤٣/١٠).

(٧٢) انظر : كتاب (( منهج على رضي الله في الدعوة إلى الله )) ( ص:١٤٨).

(٧٣) أخرجه: البخاري في: ((الأدب المفرد)) (٥١٨)، ومسلم (٢٢٥٦) ، و أحمد في ((المسند)) (٢٧/٣) رقم (١١١٨٠) وقال محققه إسناده صحيح ،و ابن حبان في ((الصحيح)) (٧٠٩) ، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الأدب المفرد)) (٤٠٣) ، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (١٩٨١)، (( صحيح ابن ماجة)) (١٢٧٧).

(٧٤) أخرجه : الديلمى كما في ((مختصر مسند الديلمى)) (٥١/١) ،وحسنة الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٤٢١) وفي ((الصحيح الجامع)) (٨٤٩).

هاندەرێك بۆ ئەوەی نوێژەکەی چاکتر بێت، وە نوێژ بکە وەك نوێژی ئادەمیزادێك کەوا بزانێت دوا نوێژە دەیکات و ئیتر نوێژی تر ناکات . وە لەڕیوایەتێکی تردا لە ئەبو ئەیوبەوە(ﷺ) دەفەرموێت: (پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەی محمد(ﷺ) ئامۆژگاریم بکە بە کورتی ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((**إذا قمت في صلاتك فصل صلاة مودع ولاتتكلم بكلام تعتذر منه غدا واجمع الأياس مما في أيدى الناس**))[٧٥]. واتە : ئەگەر هەستای بۆ نوێژ نوێژێك بکە کە وابزانیت دوا نوێژەو نوێژی خواحافیزی یە، وەقسەیەك نەکەیت کە سبەینێ لێی پەشیمان ببیتەوە، وەتەواو بێ هیوابە لەوەی کە لە دەستی خەڵکیدا هەیە . کەواتە لە نوێژدا قەدەغەیە هەموو خەیاڵێك تەنها خەیاڵی مردن نەبێت چونکە گرنگەو هاندەرێکە بۆ ئەوەی نوێژەکەت چاکتر ئەنجام بدەیت، وە هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری کردووینەتەوە کە خۆمان بە زیندوو نەزانین لە ژیانی دنیادا بەڵکو لە ڕیزی مردوواندا و خۆمان بە مردوو بزانین ، لە ئەبو دەردائەوە (ﷺ): کەوا پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگاری کردووە پێ ی فەرمووە : خوا بپەرستەو بەهیچ جۆرێك هاوبەشی بۆ بڕیار مەدە وەکاربکە کە وەکو چاوت لە خوا بێت... تا دەفەرموێت ... ((**وأعدد نفسك في الموتى وأذكر الله تعالى عند كل حجر وكل شجر...**))[٧٦] . واتە: خۆت لە ڕیزی مردوەکان بژمێرە وە یادی خوای گەورە بکە لە لای هەموو دارێك ولای هەموو بەردێك ، وەهەروەها پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی ڕاگەیاندووین کە زیاتر بیرکردنەوە لە مردن نیشانەی شەرم کردنی تەواوە لە خوای گەورە . پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (شەرم کردنی تەواوەتی لە خوا چەند شتێکە لەوانە ئەوەیە کە سەر بپارێزیت و وە ئەوەی کە لە ناو سەردایە ، وە سك بپارێزیت و ئەوەی دەچێتە ناو سك تا دەفەرموێت : ....((**وتتذكر الموتى والبلى**)) ..... وە هەمیشە بیری مردن و ڕزینی خۆت بکەرەوە هەرکەس

---

(٧٥) أخرجه: أحمد في ((المسند)) (٤١٢/٥)، وابن ماجة في ((السنن)) (٤١٧١) ، والطبراني في ((المعجم الكبير)) (٤٥٨٨)، والقضاعي في ((مسند الشهاب)) (٩٥٢) ، والحاكم في ((المستدرك)) (٣٢٦/٤) ، وصححه ووافقة الذهبي ، وأبو نعيم في (( الحلية )) (٤٦٢/١) ، و حسنه الشيخ الألباني في (( صحيح سنن ابن ماجة )) (٣٣٦٣) ، و في ((السلسلة الصحيحة )) (١٠٣٥، ٤٠١) ، وحسنه الأرناؤوط في ((جامع العلوم)) (٣٨٦/١).

(٧٦) أخرجه : الطبراني في: ((الكبير)) (١٧٥/٢٠)، وحسنه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٤٧٤- ١٤٧٥)، وفي ((صحيح الجامع)) (١٠٣٥-١٠٤١) .

ئەوە بکات تەواو شەرمی لە خوا کردووە ... ((ومن أراد الآخرة ترك زينة الدنيا..))[٧٧].
واتە: هەر کەسێك قیامەتی لا مەبەست بێت واز لە جوانی دونیا دەهێنێت . وە هەرکاتێك گۆڕێکی ببینیایە دەچوو سەیری دەکردوو لێ ی وورد دە بۆوە و پەندی لێ وەردەگرت، لەبەرائەوە (رضي الله عنه) دەفەرموێت : لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)دا بووم لەگۆڕستانی شاری مەدینە کۆمەڵێ موسوڵمانانی بینی فەرمووی: (ئەمانە بۆچی کۆبوونەتەوە؟) دیارە لای گۆڕەکانی (بەقیع) بوون ئەفەرموێت : پیَ ی ووترا ئەو کۆمەڵە کۆ بوونەتەوە گۆڕێك هەڵدەکەنن ، ئەفەرموێت: کە ئەمەیان پێ ووت ترسی لێ نیشت و بەپەلە ڕۆیشت تا خۆی گەیاندە ئەو گۆڕە و بەسەر ئەژنۆدا کەوت و تەماشای ناو گۆڕەکەی کرد وە منیش خێرا خۆم گەیاندێ تا بزانم پێغەمبەر (ﷺ) چی دەکات ئەفەرموێت تەماشای پێغەمبەرم کرد (ﷺ) تەماشای گۆڕەکەی دەکردو دەگریاو فرمێسك لە چاوی دەهاتە خوار تا خۆڵەکەی ژێر ڕیشی تەڕ کرد بوو ئینجا ڕووی کردە ئێمەو فەرمووی: (( يا إخواني لمثل هذا ((اليوم)) فأعدوا))[٧٨].
واتە: (ئەی برایانم بۆ ڕۆژێکی ئاوها خۆتان ئامادە بکەن) وە هەروەها زاوای پێغەمبەر (ﷺ) عوسمان کوڕی عەفان (خوای لێ ڕازی بێت) تەنها بەبینینی گۆڕ فرمێسك لە چاوی دەهاتە خوارەوە .... هانئی خزمەتکاری عوسمان (رضي الله عنه) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت : (...گەر عوسمان بگەیشتایە بە گۆڕێك تەماشای دەکردو فرمێسك لە چاوی دەهاتە خوارەوە تا ڕیشی تەڕ دەکرد، پیَ ی ووترا باسی بەهەشت و دۆزەخ دەکرێت ناگریت و پیَ ی دڵتەنگ نابیت بەڵام باسی گۆڕ دەکرێت فرمێسك بە چاوتا دێتە خوار؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی : گوێم لە پێغەمبەر بوو (ﷺ) کە فەرمووی : ((إن القبر أول منزل من منازل الآخرة فإن نجا منه فما بعدهُ أيسرُ منه وإن لم ينج منه فما بعدهُ أشد منه ((قال)): ما رأيت منظراً قط إلا والقبرُ اَفظع منه ))[٧٩]

(٧٧) أخرجه: الترمذي في ((السنن)) (٢٤٨٥) ، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٢٠٠٠) ، وفي المشكاة (١٦٠٨) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٩٣٥).

(٧٨) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (٢٩٤/٤) ، وابن ماجة في ((السنن)) :(٤١٩٥) ، والبيهقي في ((شعب الإيمان)) (١٠٥٤)، وحسنه الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٣٨٣) ، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (١٧٥١) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٢٦٥٩) .

(٧٩) أخرجه : ابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٦٧) ، والبيهقي في (شعب الإيمان) (٣٩٧) وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٢٢) ، وفي(( المشكاة)) (١٣٢٩).

واتە : گۆڕ یەکەم قۆناغە لە قۆناغەکانی ڕۆژی دوایی گەر لە قۆناغی یەکەمەدا ڕزگاری بوو قۆناغەکانی تری ئاسان ترە ، وە گەر تیا بچێت ئەوا قۆناغەکانی تری سەخت ترەو ناڕەحەت ترە، وە هیچ دیمەنێکم نەبینیوە لە گۆڕ دژوار ترو نا ڕەحەت تربێت بۆیە (تابعی) بەڕێز سوەیدی کوڕی عەمر دەفەرموێت: " ڕەبیع کوڕی ئەبی ڕاشید هەرکاتێك یەکێك لە دەراوسێکانی بمردایە تا چەند ڕۆژێك بێ ئاگادەبوو"(٨٠) وە(**الأعمش** ) (رحمه الله ) دەفەرموێت : " **إذا مات أقران الرجل فقد مات** "(٨١) . واتە هەرکەسێك هاوتەمەن و ناسراوەکانی بمرێت وەك خۆی مردبێت وایە.کەواتە دەبێت بەم شێوەیە یادی مردن بکەین و خۆمان ئامادە بکەین بۆ ئەو کاتەی کە موسڵمانان لاشەمان بەرەو گۆڕدەبەن وە فریشتە بەڕێزەکانیش گیانمان دەبەن بەرەو لای خوای گەورە(تبارك و تعالی) .

# نیشانەکانی عاقیبەت خێری

پێغەمبەر(ﷺ) چەند نیشانەیەکی بۆ ڕوون کردووینەتەوە کە بە نیشانەی عاقیبەت خێری داوەتە قەڵەم و ئەگەر بە هەر موسوڵمانێکەوە بینرا هیوا وایە کە ئەو موسوڵمانە بەهەشتی بێت، وە لە دنیادا دەردەچێت بەو نیشانانە دەزانرێت کە ئەوە بەهەشتی یە، سەرەتا پێغەمبەر(ﷺ) پێمان ڕادەگەیەنێت کە کۆتایی کارەکانمان گرنگە لای خوای گەورە، وەکو پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت : ((**إنما الأعمال** ((**بخواتيمها**)) **كالوعاء إذا طاب أسفله طاب أعلاهُ**)) ((**وإذا فسد أسفله فسد أعلاه**))(٨٢). واتە : (هەموو کردەوەکانی ئادەمیزاد بە کۆتایی یەکەیەتی وەك تورەکەیەك وایە گەر ژێرەکەی باش بێت سەرەوەشی باش دەبێت وەگەر خوارەوەی خراپ بێت بێ گومان سەرەوەشی خراپ دەبێت)، وە هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : (بەندەی وا هەیە ئەوەندە نوێژو عیبادەت دەکات هەتا درێژی گەزێکی دەمێنێت بۆ بەهەشت

(٨٠) أخرجه: ابن ابي الدنيا (( كتاب القبور )) و قال محققه : اسناده حسن .

(٨١) أخرجه: البيهقي ((الذهد)) (٦٤٧) ، وابن أبي الدنيا (( ذكر الموت )) (٧٤).

(٨٢) أخرجه: أحمد في ((المسند)) (٩٤/٤) عن معاوية ، وابن ماجة في ((السنن)) (٤١٩٩) واللفظ له ، وأبو يعلى في ((المسند)) (١٧٧٦/٤) ، والطبراني في ((المعجم الكبير)) (٨٦٦/١٩) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣٣٩) وقال محققه: إسناده حسن ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٣٨٥) ، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (١٧٣٤) .

بەلاّم لەکۆتایدا کردەوەیەکی دۆزەخانە دەکات و بەردەوام دەبێ لەسەری و دەمرێت و دەچێتە دۆزەخەوە)[٨٣] ، ئەگەر گەنجێك لە سایەی خوا پەرستیدا گەورە بوویێت و پەروەردە بوویێت کە سەرەتایی کارەکەیەتی هیوا وایە کۆتایی کارەکەشی هەر وابێت ، وە هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) بۆی ڕوون کردووینەتەوە ئەگەر خوای گەورە خێری بۆ هەرکەسێك بوویت چی لێ دەکات : دەفەرمویت : لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه):(([إذا أراد الله بعبد خيرا إستعمله] [طهره قبل موته]))[٨٤].واتە: ئەگەر خوای گەورە خێری بۆ هەرکەسێك بویت پاکی دەکاتەوە پێش مردنی و بەکاری دەهێنێت...

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمویت : [قيل كيف يستعمله] واتە: پرسیار کرا چۆن بەکاری دەهێنێت؟ . قال : [ ((يوفقه لعمل صالح قبل الموت ثم يقبضه عليه)) ((حتى يرضى عنه من حوله])) [٨٥].فەرمووی: کارێکی چاکی بۆ ئاسان دەکات تا لەسەر ئەو کارە چاکە گیانی دەکێشێت هەتا پێش گیان کێشانی وای لێ دەکات کە هەموو چوار دەوری لێ ی ڕازی بن .

عائیشە ( رضي الله عنها) دەفەرمویت :" إنَّ الله إذا أراد بعبده خيراً قيّضَ له ملكاً قبل موته بعامٍ فسدَّدُه ويَسُرَّهُ حتى يموتَ و هو خيرٌ ماكان ... وإذا اراد بعبد سوءاً قيّضّ له شيطانا قبل موتهِ بعامٍ فصّدهُ و أضلَهُ و فتَّنهُ حتى يموتَ شرَّ ماكان و يقول الناسُ : مات فلان و هو شرُّ ماكان "[٨٦] . واتە: گەر خوای گەورە ویستی چاکە بە بەندەکەی هەبێت ، پێش مردنی بەساڵێك فریشتەیەك دەکاتە هاوڕێی ، ڕێکی دەکات و چاکەی لا ئاسان دەکات تا لە سەر چاکترین ڕەفتار دەمرێت ، وە گەر ویستی ناباشی بە بەندەکەی هەبێت ، پێش مردنی بەساڵێك شەیتانێك دەکات بە هاوڕێی ، هەڵی دەگرێتەوە و دووری دەخاتەوە و سەری لێ

(٨٣) أخرجه:البخاري (٦٥٩٤).

(٨٤) في رواية .

(٨٥) أخرجه: أحمد ((المسند)) (٥/٢٢٤)، والترمذي في ((السنن)) (٢١٤٢)، والحاكم في ((المسند)) (١/٣٤٠) و صححه ووافقه الذهبي والطبراني في ((المعجم الكبير)) (٧٥٢٢)، والبزار في ((المسند)) (٢١٥٥) وابن حبان في ((الصحيح)) (٣٤١-٣٤٣) وقال محققه : إسناده صحيح على شرط مسلم ، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١١١٤) وفي ((صحيح الجامع)) (٣٠٤ - ٣٠٧) .

(٨٦) أخرجه : عبد الرزاق (المصنف)) برقم (٦٧٤٩).

دەشێوێنێت و گومڕای دەکات ، تا لەسەر خراپترین ڕفتار دەمرێت و خەڵکان دەڵێن : ئەو کەسە لەسەر ناشیرین ترین ڕفتاری مرد.

**(شێخی الألبانی)(رحمه الله) چەندین نیشانەی عاقیبەت خێری کۆکردۆتەوە[٨٧]**

لەوانە:ـ

١ ـ هەر موسوڵمانێك بە ووشەی (لاإلـه إلاّ الله) گیانی بکێشرێت ئەوە بەهەشتی یە و عاقیبەت خێرە .

٢ ـ موسوڵمانێك ئەگەر لە سەرە مەرگدا ناوچەوانی عارەقی لێ بتکێت .

٣ ـ مردن لە شەوی جومعەدا .

٤ ـ مردن و شەهید بوون لە گۆڕەپانی شەڕدا .

٥ ـ مردن لە ڕێگەی جیهاد .(واتە:کە دەچێت بۆ جیهاد لە ڕێگادا بمرێت) .

٦ ـ مردن بەهۆی ڕوخانی شتێك بە سەریدا یاخود بە نەخۆشی تاعون یان نەخۆشی ناو سك ئایا سك چوون بێت یان ڕیخۆڵەکوێرە بێت، وە مردن بەهۆی خنکاندنەوە، وە مردنی ئافرەت بەسەر منداڵەکەیەوە، وە مردن بە سووتاوی ،و وە مردن بەهۆی ئاوسانی پەردەی ناوەوەی پەراسوەوە، وەمردن لە پێناوی بەرگری کردن لە ماڵ و نەفس و دین ، وە مردن لە پێناوی خوادا لە کاتی پاسەوانی و ڕوبەڕوبوونەوەی دوژمن ، وە مردن لەسەر کارێکی چاکە وە کو ئادەمیزادێك لە کاتی نوێژدا بمرێ یاخود خەریکی خێرێکەو لەکاتی ئەو خێرەدا بمرێ یان ڕۆژووەوانێك بمرێت یان لە کاتی زیکردا بێت هیوا وایە (إنشاء الله) بەهەشتی بێت . وە هەرکەسێك ئامۆژگاری فەرمان ڕەوایەکی ستەمکار بکات فەرمان ڕەواکەش بیکوژێت لەبەر ئەوەی ئامۆژگاری کردووە ، وە هەروەها کەسێك لە شاری مەدینە خوای گەورە مردنی بەنسیب بکات هیوا وایە بەهەشتی بێت وەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) دەیگێڕێتەوە (( من إستطاع منكم أن يموت بالمدينة فليفعل فإني أشفع لِمن يموت بها))[٨٨]،

---

(٨٧) انظر :أحكام الجنائز (ص:٤٨)

(٨٨) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (٧٤/٤) ، والترمذي في ((السنن)) (٣٩١٧) ، وابن ماجة في ((السنن)) (٣١١٢)، و الطبراني في ((المعجم الكبير)) (٨٢٥/٢٤) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣٧٤١) وقال محققه إسناده صحيح على

واته هەرکەسێك له ئێوه ئەگەر ئەتوانێت با بمرێت له مەدینه چونکه من تکا ئەکەم بۆ ئەو کەسەی له مەدینه دەمرێت . کەواته هیوا وایه که خوای گەوره ئەگەر لاشەی بگەیەنێته گۆڕستانی هاوەڵان و تابعین و زانایانی ئەهلی مەدینه له گۆڕستانی (بەقیع) و گۆڕستانەکانی تری مەدینه هیوا وایه (إنشاء الله) بەهەشتی بێت و عاقیبەت خێر بێت ، چونکه پێغەمبەر(ﷺ) مژدەی داوه شەفاعەتی بۆ بکات . له ڕیوایەتێکی تردا هاتووه: ((**من مات في أحد الحرمين بعث آمنا يوم القيامة**)) [٨٩] .واته: هەرکەسێك له مەککه یاخود له مەدینه بمرێت هیوا وایه که خوای گەوره به دڵنیایی و بێ ترسەوه زیندووی بکاتەوه له ڕۆژی قیامەتدا (إنشاءالله) ، وه هیچ ترسێکی لەسەر نی یه .

هەروەها مردن له پێناوی بەرگری کردنی له خێزان و ژنی خۆی هیوا وایه بچێته ڕیزی شەهیدەکان چونکه پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت له سەعیدی کوڕی زەیدەوه (رضي الله عنه) :
((... **ومن قتل دون أهله فهو شهيد**)) [٩٠] .واته : هەرکەسێك بەرگری له خێزان و ژنی خۆی بکات و بکوژرێت ئەوه شەهیده، جا پێویسته ئادەمیزاد ڕێگەیەك لەو ڕێگانه بۆخۆی به دەست بهێنێت بۆ ئەوەی عاقیبەت خێر بێت وه لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر(ﷺ) له دوعاکانیدا دەیفەرموو له حەدیسی (أبی اليسر) (رضي الله عنه) دەفەرموێت: ((**اللهم إنی أعوذ بك من ((الهرم)) و التردی والهدم والغرق و الحرق وأعوذ بك أن يتخبطنی الشيطان عند الموت وأعوذ بك أن أموت فی سبيلك مدبرا وأعوذ بك أن أموت لديغا**)) [٩١] دەیفەرموو: ( خوایه پەنا به تۆ

---

شرطهما ، وحسن إسناده الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (٣٠٦/٣) وصححه الشيخ الألبلنی في ((صحيح سنن الترمذي)) (٣٠٧٦) ، وفي ((صحيح ابن ماجة)) (٢٥٢٦) ، وفي ((المشكاة)) (٢٧٥٠) .

(٨٩) أخرجه: الطبراني في ((المعجم الصغير)) (٨٢٧١) ، وفي ((المعجم الأوسط))(٢٣٧٥) وإسناده حسن كما قال ابن حجر الهيثمي في ((معجم الزوائد)) (٣١٩/٢)، وأخرجه : الطيالسي (٦٥/١٢)، والبيهقي ((الكبرى)) (٢٤٥/٥) ، وفي ((الشعب)) (٤١٥١) ، وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الترغيب)) (٧٦٦،٧٦٨).

(٩٠) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (١٦٥٢)، وصحح إسناده الشيخ الألباني في (( أحكام الجنائز)) (ص : ٥٧) ، و قد جمع الإمام السيوطي أنواع الشهداء ، فناهزوا الثلاثين . انظر : ((تنوير الحوالك)) (٢٣٣/١)، و انظر ((إتحاف النبلاء بفضل الشهادة و أنواع الشهداء)) (ص:٤٢-٧٠) .

(٩١) أخرجه النسائي في ((السنن)) (٢٨٢/٨) ، و أبو داود في ((السنن)) (١٥٤١) و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن للنسائی)) (٥١٠٤) ، وفي ((صحيح سنن أبی داود)) (١٣٨٨) ، وفي ((صحيح الجامع)) (١٢٨٢) .

دەگرم کە لە پیریدا بمرم یان لە شوێنێکەوە بکەومە خوارەوە یان دیوارێکم بەسەردا بڕوخێت یا بخنکێم یان بسوتێم ، وە پەنا بە تۆ دەگرم لە شەیتان کە سەرم لێ تێك بدات لەکاتی سەرە مەرگدا وە پەنا بە تۆ دەگرم کە بمرم بەڕاکردوویی لە دەستی دوژمنان وە پەنا بە تۆ دەگرم ،بە پێوەدانی مارێك یان دووپشکێك بمرم) . وە هەروەها چاکترین مردن ئەو مردنەیە کە ئادەمیزاد بمرێت لە پێناوی بە دیهێنانی مافێکی خۆیدا وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (( **نعم الميتةُ ان يموت الرجل دون حقه** ))[٩٢]. واتە: چاکترین مردن ئەوەیە کە پیاو بمرێت لە پێناوی بەدەست هێنان و پارێزگاری کردن لە مافێکی خۆی. کەواتە داوا لە خوای گەورە دەکەین ئەو مردنە چاکانەمان بە نسیب بکات نەك مردنێك کە خۆشی قیامەت و ڕازی بوونی خوای گەورەی تیادا بەدەست نەیەت، وە کو خوای گەورە ڕوونی کردووەتەوە کە باشترین مردن شەهیدی یە، وەهەروەها پێغەمبەر(ﷺ) خۆی دەفەرموێت : (ئەگەر یەکێك لە ئێوە ئاواتە خواز بوو شەهید بێت با داوای شەهیدی بکات لە خوای گەورە چونکە هەرکەسێك بەڕاستی داوای شەهیدی بکات خوا دەیگەیەنێتە پلەی شەهیدەکان ، ئەگەر لە سەر جێگەشدا بمرێت . وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (( **من سأل الله الشهادة بصدقٍ ، بلّغهُ الله منازل الشهداء وإن مات على فراشه**))[٩٣].

## نارەحەتیەکانی گیان کێشان

هەندێ لە پیاو چاکان مردنیان لەسەر نارەحەت دەکرێت هەروەکو لە عائشەوە (رضي الله عنها) دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(( **إن الصالحين يُشدد عليهم** ))[٩٤] واتە : پیاو چاکان بەلایان لەسەر توند دەکرێت . لێرەدا دوو مانا دەگرێتەوە لەوە دەچێ نەخۆشیەکەی یەکجار توندبێت بەسەرەوە تا کاتی گیان دەرچوون ئینجا گیانی بە ئارامی دەردەچێت ، وە یان بۆ بەرزکردنەوەی پلەی ئەو موسولمانانە بێ لە قیامەت دا . کاتی عەمری کوڕی عاص لە

(٩٢) أخرجه:أحمد (١٥٩٨) ، وابو نعيم ((الحلية)) (٢٩٠/٨) وحسنه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٦٩٧)، و ((صحيح الجامع)) (٦٧٧٥).

(٩٣) أخرجه : مسلم (١٩٠٩) ، و أبوداود (١٥٢٠).

(٩٤) أخرجه: أحمد في ((المسند)) (١٥٩/٦)، والحاكم في ((المستدرك)) (٣١٩/٤) وصححه ووافقه الذهبي، وابن حبان في ((الصحيح)) (٢٩١٩)، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٦١٠) ، وفي ((صحيح الجامع)) (١٦٦٠) .

سەرە مەرگدا بوو عبدولاّی کوڕی پێی ڕاگەیاندو و فەرمووی : ئەی باوکە تۆ هەموو جار دەت ووت خۆزگە ئادەمیزادێکی ژیرم لەسەرەمەرگدا دەست دەکەوت و پێی بوتمایە کە گیان کێشان، چۆنە ئەوا ئێستا لە تۆش ژیرترمان دەست ناکەوێت و لەسەرە مەرگ دایت چۆن هەست بە خۆت دەکەیت؟ ئەویش فەرمووی: وەڵاهی وا ئەزانم ئەم لاو ئەو لام لە نێوان دوو دار و دوو تاشە بەرد دایە ئاوا دەگوشرێت بەیەکدا وەهەست دەکەم هەناسەم لە کونە دەرزیەکەوە بۆ دێت وە وا ئەزانم پەلە دارێکی دڕکاوی لە قاچمەوە ڕادەکێشرێت بەرەو سەرم) (٩٥).

کەوا بوو ئەوەتا عەمری کوڕی عاص (رضي الله عنه) بەو شێوەیە باسی خۆی دەکات ئەگەر ڕیوایەتەکە (صحیح) بێت ... وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (( **معالجة ملك الموت اشدُّ من الف ضربة بالسيف ، وما من مؤمن يموت إلا وكلُ عِرقٍ منه يألم على حدة**)) واتە: مردن ناڕەحەت ترە لە بەکارهێنانی هەزار شمشێر لەسەر جەستەی ئەو مرۆڤە و لە کاتی ڕۆح کێشاندا خاوەن باوەڕ هەموو دەمارو شوێنێکی لاشەی بە جیا ئازاری خۆی پێ دەگات) (٩٦). بێ گومان گیان کێشان و مردن ڕێگەیەکی حەتمی وگشتیە بۆ هەموو مرۆڤێك وەکو خوای گەورە (تبارك وتعالى) دەفەرموێت :﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِۗ ... ﴿١٨٥﴾ ﴾ (آل عمران: ١٨). واتە: هەموو نەفسێك دەبێت مردن بچێژێت ، وەهەروەها دەفەرموێت :

﴿ ... كُلُّ شَىْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥۚ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾ (القصص: ٨٨ ) واتە : هەمووشتێك دەبێت لەناو بچێت تەنها خوای گەورە دەمێنێتەوە ... گیان کێشان خۆی لە خۆیدا ناڕەحەتی یەکی گەورەیە ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَجَآءَتْ سَكْرَةُ ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ ﴿١٩﴾ ﴾(ق :١٩) (**سكرة**) واتە: ناڕەحەتی گیان کێشان گەیشتە لات .

وە دەفەرموێت:﴿ ...وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓاْ أَنفُسَكُمُۖ ...﴿٩٣﴾ ﴾ (الأنعام: ٩٣). ووشەی ((**غمرات**)) واتە: گیان کێشان هەموو جەستەی

---

(٩٥) أخرجه :ابن سعد في ((الطبقات)) (٢٦٠/٤) ، وابن أبي الدنيا في كتابيه (كتاب المحتضرين) (١٠٣) ، و (كتاب المتمنين) (٩٣).

(٩٦) أخرجه :الحارث بن ابى اسامة في ((مسنده)) (( بغية الباحث)) (٢٥٢) باسنادٍ جيد كما قال السيوطى في (شرح الصدر) (ص : ٢٤)

پڕکردووە لە ئێش وئازار، ولە ئایەتەکەی تردا دەفـەرموێت : ﴿فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾﴾ (الواقعة: ٨٣ - ٨٥).

حەسەنی بەصری دەفەرموێت : "ناڕەحەترین کـاتی گیـان دەرچـوون ئەوکاتەیـە کـە ڕۆح دەگاتـە گـەروی ئـادەمیزاد ئـەو کاتـە هەناسـەی تونـد دەبێـت و دەلـەرزێت"[٩٧] . ئەمـەش ڕوونکراوەتەوە لە ئایەتێکی تردا کە دەفەرموێت :

﴿كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِىَ ﴿٢٦﴾ وَقِيلَ مَنْ ۜ رَاقٍ ﴿٢٧﴾ وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلْفِرَاقُ ﴿٢٨﴾﴾ (القيامة: ٢٦ - ٢٨) ووشەی (تراقی) واتە : قوڕقوراگە. کەواتە دەرکەوت کە گیان کێشان زۆر ناڕەحەتە بەڵام بۆ کێ ؟ بێ‌گومـان بـۆ کافران و دووڕوان زۆر ناڕەحەتە وە بۆ خـاوەن بـاوەڕ زۆر سـوکە بەشـێوەیەکی گـشتی ، بـەڵام هەندێك جار خوای گەورە مردن و ڕۆح دەرچوون لەسەر هەندێك بێ باوەڕ سووك دەکات بـەهۆی پاداشتی کارێکی چاکیەوە. وە مردن گران و ناڕەحەت دەکات بەسەر هەنـدێك بـاوەڕدارەوە تـا ببێتە هۆی سڕینەوەی هەندێك لەگوناهەکانیەوە. ابن مسعود (رضي الله عنه) دەفەرموێت :

" **إنَّ المؤمن يُشدّدُ عليه عند موته بالسيئة قد عملها لتكون بهـا ، وإنَّ الكـافر ليُهَّـونُ عليـه عند موته بالحسنة قد عملها لتكون بها** "[٩٨]. واتە: بـڕوادار مردنـی لەسـەر گـران دەکرێـت بەهۆی تاوانێکەوە ئەنجامی داوە تا ببێتە هۆی سڕینەوەی ئەو تاوانە. وەبـێ بـاوەڕیش مردنـی لەسەر ئاسان دەکرێت بەهۆی چاکیەکەوە ئەنجامی دابێت تا ببێتە پاداشتی ئەو چاکەیەی لێرەدا عومەر کوری عبدولعەزیز دەفەرموێت:" **ما يَسرُّني أن يخفف عني سكرات المـوت لأنـه آخـر مايؤجر عليه المسلم**" [٩٩] واتە: پێم خۆش نیە ناڕەحەتیەکانی گیان کێشانم لەسـەر سـوك بێـت چونکە ئەوە دواهەمین شتەکە مووسڵمان پاداشتی لەسەر وەردەگرێت. بـەڵام هەنـدێك لـەخاوەن باوەڕان مردنیان زۆر لەسەر قورسە ئەوانیش ئەو چینە بەرێزەن کەپلەوپایـەیان زۆربـەرزە لـەلای خوای خۆیان ، عـائیشە (رضي الله عنهـا) دەفـەرموێت: ((**إن رسـول الله (صلى الله عليه وسلم) كـان بـين يديـه**

(٩٧) أخرجه: ابن أبي الدنيا كما في (( لطائف المعارف)) لابن رجب (ص:٤٦٢).

(٩٨) أخرجه: عبد الرزاق (( المصنف)) برقم (٦٧٧٢).

(٩٩) أخرجه: ابن عساكر (٤٥/٢٥٠) ، وابن ابي الدنيا (( ذكر الموت )) (٢٤).

ركوة - أو علبة - فيها الماء - يشك عمر- فجعل يدخل يده في الماء فيمسح بها وجهه ويقول: ((لا إله إلاّ الله إن للموت سكرات)) (١٠٠).

واته: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەره مەرگدا جامێكی لەبەر دەستدا بوو پڕ بوو لە ئاو لە كاتی ناڕەحەتی گیان كێشانیدا دەستی دەخستە ناو جامە ئاوەكەوەو دەیهێنا بە دەم و چاویدا و دەیفەرموو: ((لا إله إلا الله..)) ئای گیان كێشان ناڕەحەتی زۆرە.

وە هەورەها عائیشە دەفەرموێت (ﷺ): ((مات النبی (ﷺ) وإنّه لبين حاقنتي وذاقنتي فلا أكره شدة الموت لأحد أبداً بعد ما رأيت من رسول الله (ﷺ) )) (١٠١) واته: پێغەمبەر(ﷺ) لە باوەشمدا لەسەر ڕانم گیانی موبارەكی دەرچوو وەڵاهی ئاوات ناخوازم كە مردنێكی ئاسان بە نسیب هیچ كەسێك بێت دوای ئەوەی بە چاوی خۆم بینیم كە چەند بە سەختی و ناڕەحەتی پێغەمبەر (ﷺ) گیانی دەرچوو، وە لە ڕیوایەتێكی تردا دەفەرموێت : (( ما أغبط احداً بهون الموت بعد الذى رأيت من شدة موت رسول الله(ﷺ) )) (١٠٢).واته: هەرگیز ئاوات ناخوازم كە مردنێكی ئاسان بە نسیب هیچ كەسێك ببێت دوای ئەوەی بەچاوی خۆم ناڕەحەتی و سەختی گیان كێشانی پێغەمبەری ئازیزم بینی (ﷺ) . ڕۆح خۆی پێی خۆش نی یە لەو لاشەیەی كە تەمەنێكی تیادا بەسەربردووە بێتە دەرەوە ، بۆیە لە ڕیوایەتێكدا هاتووە كە فەرموودەكە ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەیگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((قال الله تبارك وتعالى للنفس أخرجي، قالت : لاأخرج إلاّ كارهة ، قال : أخرجي وإن كرهت)) (١٠٣) واته: خوای گەورە بە ڕۆح دەفەرموێت : وەرە دەرەوە ئەویش دەڵێت نایەمە دەرەوە بە ناخۆشی نەبێت، خوای گەورەش دەفەرموێت وەرە دەرەوە ئەگەر چی پێشت ناخۆش بێت. كەواتە بە ناڕەحەتی دێتە دەرەوە، وە هەروەها لەفەرموودەیەكی (قودسی) دا دەفەرموێت:

---

(١٠٠) أخرجه: البخاري في ((الصحيح)) (٦٥١٠) .

(١٠١) أخرجه: البخاري في ((الصحيح)) (٤٤٤٦) ، والنسائي في ((السنن الكبرى)) (١٩٥٦) وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (١٧٢٦).

(١٠٢) أخرجة:الترمذي في ((السنن)) (٨٩٢)،و صححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن الترمذي) (٧٨٣)،و في ((مختصر الشمائل المحمدية )) (٣٢٥).

(١٠٣) أخرجه:البزار في ((المسند)) (٧٧٩)، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)):(٣٢٥/٢) رواه البزار ورجاله ثقات،وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع))((ترتيب صحيح الجامع) (٢٠/٤) (٢٦).

((وما ترددت عن شيءٍ أنا فاعله ، ترددي عن نفس المؤمن يكرهُ الموت وأنا أكره مساءته..)) [١٠٤] واته: (خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت له هیچ شتێکدا دوودڵ نه‌بووم ته‌نها له گیان كێشانی خاوه‌ن باوه‌ڕدا نه‌بێت که ئه‌و مردنی پێناخۆشه (چونکه ناڕه‌حه‌تیه بۆی) به‌ڵام منیش پێم ناخۆشه ناڕه‌حه‌تی بکه‌م به‌ڵام ده‌بێت هه‌ر بیچێژێت) هه‌ندێ له پیاو چاکان مردنیان زۆر له سه‌ر سووك ده‌بێت وه هه‌ندێکی تریان مردنیان زۆر له‌سه‌ر قورس ده‌کرێت و تا ماوه‌یه‌کی زۆریش ئه‌و ئازاره هه‌ست پێ ده‌که‌ن جابر بن عبدالله (ﷺ) ده‌گێڕێته‌وه له پێغه‌مبه‌ره‌وه (ﷺ) که فه‌رموویه‌تی: ((کۆمه‌ڵێك له به‌نی ئیسرائیلیه‌کان ڕۆیشتن بۆ سه‌ر یه‌کێك له گۆڕستانه‌کانیان و ووتیان : با دووڕکات نوێژ بکه‌ین و داواکه‌ین له خوای گه‌وره که یه‌کێك له پیاوه مردووه‌کانی ئه‌م گۆڕستانه‌مان بۆ زیندوو بکاته‌وه و بیهێنێته‌ده‌ر تا پرسیاری چۆنیه‌تی مردنی لێ بکه‌ین، ئه‌وه بوو دووڕکاته نوێژه‌که‌یان کردوو، وئه‌وه‌نده‌ی پێ نه‌چوو سه‌ری گۆڕێك له‌و گۆڕانه بوو به دوو به‌ش و له‌یه‌ك جیابووه‌وه ، و پیاوێکی گه‌نم ڕه‌نگ که شوێنه‌واری سوجده بردنی به‌ناو چه‌وانه‌وه دیار بوو ، سه‌ری له‌و گۆڕه به‌رزکرده‌وه و به‌وانی ووت : (( يا هؤلاء ما أردتم إليّ؟ فقد متُ مُنذ مائة سنةٍ ، فما سكنت عني حرارة الموت حتى كان الآن ، فادعوا الله عزوجل لي يعيدُني كما كنتُ)) واته: ئێوه چ کارێکتان به‌من هه‌یه ، من سه‌د ساڵ له‌مه‌و پێش مردم تا ئێستا ئازاری مردنم له‌سه‌ر نه‌سره‌وتووه تا ئه‌م داوایه‌ی ئێوه ، ده‌ی داوا بکه‌ن له خوای گه‌وره بمگێڕێته‌وه‌و وه‌کو خۆمم لێ بکاته‌وه)[١٠٥] .

چه‌ند چینێك هه‌ن که ڕۆحیان به ئاسانی ده‌کێشرێت له‌وانه( شه‌هید) وه‌ك له فه‌رمووده‌که‌ی پێغه‌مبه‌ر(ﷺ)دا هاتووه که فه‌رموویه‌تی : (الشهيد لا يجد ((أَلَم)) القتل إلاّ كما يجد أحدكم مس القرصة)) [١٠٦]واته : شه‌هید ناڕه‌حه‌تی کوشتنه‌که‌ی ناچێژێت ته‌نها وه‌کو

---

(١٠٤) أخرجه: البخاري في : ((الصحيح)) (٦٥٠٢).

(١٠٥) أخرجه : أحمد في (( الزهد )) (١٦) ، وعبد بن حميد في ((المنتخب)) (١/ ٦٥٢) ، و وكيع في ((الزهد)) (٥٦) ، و ابن أبي داود في ((البعث))(٣٠) ، وقال الشيخ الألباني في (( السلسلة الصحيحة)) (٢٩٢٦) : حديثٌ صحيح .

(١٠٦) أخرجه: النسائي في ((السنن )) (٣٦/٦) ، والترمذي في (( السنن)) (١٦٦٨) ، ابن ماجة في ((السنن)) (٢٨٠٢) والدارامي في ((السنن )) (٢٠٥/٢) ، والطبراني في ((المجمع الاوسط)) (٢٨٢)، والبيهقي في ((الكبرى)) (١٦٤/٩) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٤٦٥٥) وقال محققه : اسناده حسن ، وصححه الشيخ الألباني في (( صحيح سنن النسائي ))

چرنوقێك نەبێت کە لە لاشەی دەگیرێت ئەوەندە ئازاری پێ دەگات ، بەڵام لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە ئایا تەنها کوشتنەکەیە؟ یان گیان کێشان و ڕوح دەرچونەکەیە ( واللە أعلم)) پێ دەچێت هەردووکیانی لەسەر ئاسان کرابێت .

## ئەوەی کە دەبێتە هۆی ئاسان دەرچوونی ڕۆح لە لاشە

**ووتنی ووشەی ((لاإله إلاّ الله)):**

واتە ووتنی شایەتمان لەسەرە مەرگدا ، ئەبێتە هۆی پشوودان و ئاسان دەرچوونی گیانی موسوڵمان ، وەکو پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویێت : لە(**طلحة**) (رضي الله عنه) : ((**أني لأعلم كلمة لا يقولها أحد عند موته ألاّ كانت نورا لصحيفته ، وإن جسده وروحه ليجدان لها روحا عند الموت**)) [١٠٧] واتە: من ووشەیەك دەزانم هەر کەسێك لە سەرە مەرگ دا بیلێت دەبێت بە نوور لە نامەی کردەوەکانیدا لە ڕۆژی قیامەت دا وە ڕۆح و لاشەکەشی لە کاتی ڕۆح کێشاندا گەر ئەو ووشەیە بڵێت زۆر ئیسراحەت دەبێت .واتە هیچ کامێکیان ئازاریان پێ ناگات وە بە ئاسانترین شێوە لە یەکتر جیا دەبنەوە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : (( **إني لاعلم كلمة لا يقولها عبدٌ عند موته ، الا فرَّجَ الله عنه كربته وأشرق لونه [ ورأى مايسّرُهُ]**)) واتە : (من ووشەیەك دەزانم هەرکەسێك لە سەرە مەرگدا بیلێت خوای گەورە ناڕەحەتی ڕۆح دەرچوونی لەسەر ئاسان دەکات هەروەها ڕووی گەش و پرشنگدار تر دەکات و ئەوەی پێ ی شاد بێت دەیبینێت ..) [١٠٨].

---

(٢٩٦٣) وفي (( صحيح سنن الترمذي)) (١٣٦٢) وفي (( صحيح سنن ابن ماجة)) (٢٢٦٠) ، وفي ((صحيح الجامع )) (٣٧٤٥) وفي ((المشكاة)) (٣٨٣٦).

(١٠٧) أخرجه: أحمد في : ((المسند)) (٢٥٢) وقال محققه حديث صحيح، والنسائي في ((عمل اليوم والليلة)) (١١٠١) ، و ابن حبان في ((الصحيح)) (٢٠٥) وقال محققه إسناده صحيح ، وابن ماجة في ((السنن)) (٣٧٥٩) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٠٦٢)، و حول تأثير الشهادتين عند الموت انظر: ((الفوائد)).لابن القيم (صفحة:١٠١)

(١٠٨) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (١٣٨٦) وقال محققه : إسناده صحيح، والحاكم في ((المستدرك)) (٣٥٠/١) و صححه على شرطهما ووافقه الذهبي ، وأبو يعلى في((المسند)) (٦٥٥)، وقال الهيثمي في((مجمع الزوائد)) : (٣٢٥/٢) رجاله رجال الصحيح ،وصحح إسناده السيوطي في ((شرح الصدور)) (ص :٣٩).

وه له ڕیوایەتێکی تردا ...((إلاّ وجد روحه لها روحاً حتى تخرج من جسده))[١٠٩]. واتە: ڕۆحەکەی ئارامی یەکی یەکجار زۆر بە خۆیەوە هەست پێ دەکات تا لە لاشەکەی جیا دەبێتەوە ،خوای گەورە ووشەی ((لاإله إلاّ الله)) مان پێ ببەخشێت، لە سەرە مەرگدا و لاشەمان و ڕۆحمان بە ئاسانی پشوو بدەن و لێك جیا ببنەوە إنشاء الله.

وه هەروەها سەبارەت بەم باسە لە ڕیوایەتێکی تردا لە جابرەوە (رضي الله عنه) دەفەرموێت : ((ما من ميت يموت فيقرأ عنده يس إلا هون الله عزوجل –عليه)) [١١٠]. ئەم فەرموودەیە (ضعیف)ە و دروست نیە وە ناشبێ بە بەڵگە بۆ خوێندنی سورەتی (یس) بۆ کەسێك کە لەسەرەمەرگ دا بێت چونکە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) نەگێڕدراوەتەوە کە کاری وای ئەنجام دابێت، وە (ئیمامی شه عبی رحمه الله) دەفەرموێت : (پیاوە بەڕێزەکانی ئەنصاری نیشتەجێی مەدینە سوورەتی بەقەرەیان لەسەر ئەو موسوڵمانانەی کە لەسەرەمەرگ دا بوون دە خوێند بۆ ئەوەی بە ئاسانی گیانیان دەرچێت لە جەستەیان)[١١١]. ئەم قسەیە سەنەدەکەی (ضعیف)ە ،وە هەروەها لە جابری کوڕی زەید(رضي الله عنه) دەفەرموێت : ( لە زەمانی ئێمە سوورەتی ڕەعدیان دەخوێند بەسەر ئەو موسوڵمانانەی کە لەسەرە مەرگ دا بوون)[١١٢]. لە هەموان باشتر پێوتنەوەی ووشەی (لا إله الا الله) یە بۆ ئەو کەسەی لە سەرەمەرگدایە.

---

(١٠٩) أخرجه: أحمد في ((المسند)) : (١٨٧)) وقال محققه أحمد شاكرو شعب الأرناؤوط إسنادة صحيح ، وأبو يعلى في ((المسند)) (٦٤٠) وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) : (٣٢٤/٢) ، رواه أبو يعلى ورجاله رجال الصحيح .

(١١٠ ) أخرجه: الديلمي في ((مسند الفردوس )) ، (٦٠٩٩) بسند فيه ضعيف ، وفي رواية عن معقل بن يسار مرفوعا: ((اقرءوا يس على موتاكم)) وهذا الحديث ضعيف لا يحتج به . أخرجه : أحمد (٢٦/٥) ، وابن أبي شيبة (٢٣٧/٣) ، وأبو داود (٣١٢١) ، ابن ماجة (١٤٤٨) ، والطبراني ((الكبير)) (٥١٠/٢٠) ، وابن حبان (٣٠٠٢) ، وقال محققه : إسناده ضعيف ، والنسائي ((عمل اليوم والليلة)) (١٠٧٤) ، والطياليسي (٩٣١) والحاكم (٥٦٥/١) ، والبيهقي (٣٨٣/٣) وضعف إسناده الدارقطني انظر ((التلخيص)) (١٠٤/٢) ، وقال النووي في ((الأذكار)) (ص:٢١٣) إسناده كذاب ، وضعفه الشيخ الألباني في ((ضعيف سنن أبي داود)) (٦٨٣) ، و ((ضعيف سنن ابن ماجة)) (٢٧٣) ، و ((ضعيف الجامع)) (١٠٧٢) ، و((المشكاة)) (١٦٢٢) ، وانظرهُ بتوسع في ((موسوعة أطراف الحديث)) (٩٦/٢).

(١١١) أخرجه : ابن أبي شيبه في ((المصنف)) (١٠٨٤٨)، واخرجه ابن ابي داود بسند فيه ضعيف كما قال الأمام النووي في ((الأذكار)) (صفحه:٢١٣)، وانظر ((سبل السلام)) . (١٢٧/٢) .

(١١٢) أخرجه : ابن أبي شيبه في ((المصنف)) (١٠٨٥٢) .

وەهەرسەبارەت بەم باسەیە ئیمامی (جلال الدین السیوطي) دەفەرمویێت : کۆمەڵێك لە زانایان ڕایان وایە کە سیواك کردن پێش ڕۆح کێشان دەبێتە هۆی ئاسان دەرچوونی ڕۆح بە بەڵگەی فەرموودەکەی عائیشە (رضی الله عنها) دەفەرمویێت : (کە پێغەمبەر(ﷺ) لە سەرەمەرگ دا سیواکێکی بە دەست (عبدالرحمن)ەوە بینیوە و داوای کردووە لە عائیشە بۆی نەرم بکات تا دەمی پیرۆزی بەسیواك خاوێن بکات ، عائیشە (رضی الله عنها) دەفەرمویێت: سیواکێکی کرد لە ژیانیدا سیواکی وای نەکردبو وە پاشان ڕۆحی موبارەکی دەرچوو لە جەستەی پاکی) [١١٣] .وە ئەمەش تەنها بۆچوونی هەندێك کەسە و هیچ بەڵگەیەکی ڕوونی لەسەر نەهاتووە کە صحابە بەڕێزەکان و تابعیەکان و (سلف الصالح) و پیاوچاکان کاری وەهایان ئەنجام دابێت .

# ئەوەی پێویستە لەسەر موسوڵمان ئەنجامی بدات پێش گیان کێشانی

ئادەمیزاد ئەگەر چەند کاتێکی کەمی مابوو لە ژیاندا و بەرەو مردن ڕووی نابوو ، پێویستە چی بکات بۆ ئەوەی خۆی بۆ مردن ئامادە بکات؟ پێغەمبەر(ﷺ) پێ ی ڕاگەیاندووین کە هەمووومان گومانی چاکمان هەبێت بە خوای گەورە لەسەرە مەرگ دا ... لە جابرەوە (رضي الله عنه) دەفەرمویێت : **سمعت رسول الله (ﷺ) ـ يقول قبل وفاته بثلاث ((لايموتن أحدكم إلآ وهو يحسن الظنّ بالله))** [١١٤] واتە: پێغەمبەر (ﷺ) پێش سێ ڕۆژ لە وەفاتی گوێم لێ بوو دەیفەرموو: هیچ کەسێك لە ئێوە نەمرێت تا گومانی چاکی بە خوای خۆی دەبێت . گومانی چاك ئەوەیە باوەڕت وابێت کە خوای گەورە دەتخاتە بەهەشتەوە و ڕەحمت پێ دەکات وە دڵنیابیت کە لە گوناهت خۆش دەبێت. وە گومانی چاکیش بەس نی یە بەڵکو دەبێت بترسێت لەو گوناهانەی پێشتر ئەنجامی داوە...... لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) دەفەرمویێت : (پێغەمبەر(ﷺ) چووە سەردانی گەنجێك کە لەسەرەمەرگ دا بوو پێ ی فەرموو ((حاڵت چۆنە ؟)) ئەویش ووتی: وەڵاهی ئەی پێغەمبەر خوا (ﷺ) لە گوناهەکانم زۆر دەترسم و هیوای زۆریشم بە خوای خۆم

---

(١١٣) أورده: السيوطی في ((شرح الصدور)) (ص: ٣٥)

(١١٤) أخرجه: مسلم في ((الصحيح)) (٢٨٧٧).

هەیە پێغەمبەر خوا (ﷺ) فەرمووی (( **لایجتمان في قلب عبدٍ في مثل هذا الموطن الاّ اعطاه الله مايرجو وامِنُه مما يخاف** ))[١١٥]. واتە: ئەو دوانە لە دڵی هەربەندەیەکدا کۆببێتەوە لە سەرەمەرگ دا ئەوەی کە لیّ ی دەترسیّ خوای گەورە لیّ ی بیّ باك دەکات وە ئەوەیشی هیوای پیّ ی هەیە خوا هیواکەی بۆ دەهێنێتە دی. بۆیە چاکتر وایە گومانی چاك زیاتر ببەیت بە خوای خۆت کە خوا لێت خۆش دەبێت لەوەی زیاتر ترست هەبێت ...

(ئیبن و عەباس) (**رضي الله عنهما**) دەفەرموێت : (**إذا رأيتم بالرجل الموت فبشروه ليلقى ربه وهو حسن الظن بالله وإن كان حيا فخوفوه..**)[١١٦] واتە: ئەگەر زانیتان ئەو کەسە چەند ساتێکی ماوە لە ژیانیدا هیواو ڕەحمی خوای بخەنە دڵەوە بەڵام ئەگەر زیندوو بوو بیترسێنن. بەڵام لەسەرەمەرگدا تازە وا لە ژیانی درۆ دەردەچێت بەرەو ژیانی ڕاستی لەبەر ئەوە هیوای زیاتر بخەنە دڵەوە چونکە زۆر پێویستە . موسوڵمان گومان و هیوای چۆن بێت بە خوای خۆی خوا پەیمانی داوە ئەو گومانەی بۆ دەهێنێتە دیٰ چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : لە جابرەوە(رضي الله عنه) ((**من إستطاع منكم أن لا يموت إلاّ وظنه بالله حسن فليفعل**))[١١٧].واتە: هەرکەسێك لە ئێوە تا دەتوانێت گومانی باش بێت بە خوای گەورە و لەسەر ئەوەش بمرێت.هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: خوای گەورە فەرموویەتی: ((**أنا عند ظن عبدي بي إن ظن خيراً ، و إن ظَنَّ شراً ..**))[١١٨].

واتە : خوای گەورە دەفەرموێت: (من لە جێی گومانی بەندەکەمم ئەگەر گومانی چاك ببات بە من بۆی دەهێنمە دی وە ئەگەر گومانی خراپ ببات بەمن هەروەها بۆی دەهێنمە دی) . کەواتە هەرکەس گومانی وا بێت خوا سەرفرازو سەرکەوتووی دەکات و لە گوناهی خۆش دەبێت و بە

---

(١١٥) أخرجه: الترمذي في ((السنن)) (٩٨٣) ، وابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٦١) ، وحسنه الشيخ الألباني في ((أحكام الجنائز)) (ص: ٣) ، وفي ((المشكاة)) (١٦١٢)، وفي ((السلسله الصحيحه)) (١٠٥١) ، وفي ((صحيح سنن الترمذي)) (٧٨٥) ، وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٣٦).

(١١٦) أخرجه: ابن مبارك في ((الزهد)) كمافي ((شرح الصدور)) (ص: ٢٤)، وانظر حول الموضوع ((الاذكار)) للأمام النووي (ص:٢٠١). وقال إبراهيم بن الأدهم (يرحمه الله) :" كانوا يستحبون أن يلقنوا العبد محاسن عمله عند موته لكي يُحسن الظنّ بربه" . أخرجه : ابن ابي الدنيا((كتاب المحتظرين)) (٢٧).

(١١٧) أخرجه: أبو نعيم في ((الحليه)) ١٢١/٨) ، وابن حبان في((الصحيح)) (٦٣٧)) ، وقال محققه إسناده حسن.

(١١٨) أخرجه: الطبراني في ((المعجم الكبير)) (٢٠٩/٢٢) ،وابن حبان في ((الصحيح)) (٦٤١) وقال محققه إسناده: صحيح

بەهەشتی شاد دەکات ئەم گومانە خوا بۆی دەهێنێتـەدی ،وە هەرکـەس گومـانی وابێـت خـوا دەیخاتە دۆزەخ و سزای دەدات و لە گوناهی خۆش نابێت و ڕەحمی پێ ناکات ئەوا ئـەو گومانـە خراپەی بە خوای خۆی بۆ دەهێنێتە دی .. وە مژدەش دراوە بەو موسـوڵمانە بەڕێزانـە کـە بـە هیوا بوون بە ڕەحمی خوا شادبن وە لە ژیانی خۆیاندا ترساون لە خوا مژدەیان پێ دراوە کە خوای گەورە ترسیان لێ دەڕەوێنێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا وەکو خوای گەورە فەرموویەتی : ((قـال الله تعالى : **وعزتي لا أجمع على عبدي خوفين وأمنين إن هو أمنني في الدنيا أخفته يوم أجمع فيـه عبادي وان هو اخافني في الدنيا أمِنتُهُ يوم أجمع فيه عبادي))** [١١٩] واتـە : بـە عیزەتـی خـۆم هەرگیز دوو ترس ودوو دڵنیایی لە دڵی هیچ بەندەیەکدا کۆناکەمەوە ئەگەر ئەو لەژیانی دنیـادا لە من نە ترسابێت ، ئەوا من زۆر دەیترسێنم لەو ڕۆژەی بەندەکانمی تیا کۆدەکەمەوە وە ئەگەر لە دنیا لێم ترسابێت ئەوا لەو ڕۆژەدا کە بەندەکانمی تێدا کۆدەکەمـەوەدڵنیا ودوور لـە هـەموو ترسێکی دەکەم. بۆیە ئادەمیزادی موسوڵمان ئەگەر نەخۆش کەوت پێش مردنەکەی چـاك وایـە ئەو نەخۆشیەی پێ خۆش بێت و سوپاسی خوای لەسەر بکـات و پـێی ڕازی بێـت وەکـو ئـەبو هورەیرە (رضي الله عنه)دەیگێڕێتەوە و دەفـەرموێت : پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویـەتی : ((قـال الله عـز وجل : **ان المؤمن عندي بمنزلة كل خير يحمدني وأنا أنزعُ نَفسهُ مِن بَـين جنبيـهِ وهـو يحمـد الله))**[١٢٠]. واتە : خوای گەورە دەفەرمووێت خاوەن باوەڕ لای من پلەیەکی هەرە چـاکی هەیـە سوپاسم دەکات لە کاتێکدا کەمن گیانی دەکێشم لـە نێـوان هـەردوو شـانی یـەوە (واتـە: لـە قوڕقوڕاگەو بەرەو ژوور) . پێویستە پەنا بگرین بە خوای گەورە لە مردنی کوتو پڕو لە ناکـاو ، چونکە ئەو جۆرە مردنە نیشانەی غەزەبی خوایە .

---

(١١٩) أخرجه: ابن مبارك في ((الزهد)) (١٥٧) ، و ابن حبان في ((الصحيح)) (٦٤٠) وقال محققه : إسناده حسن ، و أبو نعيم في ((الحلية)) (٦/٩٨) ، وحسنه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة )) (٧٤٢) .

(١٢٠) أخرجه: أحمد في ((المسند)) (٢/٣٦١) وقال محققه الشيخ الأرناؤط :إسناده جيد، والبزار في ((المسند)) (٧٨١)، وحسن اسناده الشيخ الألباني في ((السلسلة لصحيحه)) (٤/١٧٤) رقم (١٦٣٢) ، وفي ((صحيح الجامع)) (١٩١٠) .

لە عوبەیدی کوڕی خالیدی کوڕی سولەیمی یەوە (رضي الله عنه) دەفەرمویّت : پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : ((**موت الفجاءة اخذةُ أسف**))[١٢١]. واتە : مردنی لەناکاو نیشانەی تووڕەبوونی خوایە لەوکەسە وەکو خوای گەورە دەفەرمویّت :

﴿ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ .... ﴿٥٥﴾ ﴾ (الزخرف: ٥٥)، واتە : کاتێ تورەیان کردین تۆڵەمان لێ سەندنەوە ، هەرکەسێك خوای گەورە لەناکاودا ڕۆحی بکێشێت ئەوە خوای گەورە لێ ی تورەیە و هیچ بوارێکی نادات لە دنیادا تۆبە بکات یان خۆی ئامادە بکات بۆ گەیشتن بە خوای خۆی بەلاّم لە ڕیوایەتێکدا لە دایکی بەڕێزمان عائیشە (رضي الله عنها )، وە ابن مسعود (رضي الله عنه) گێڕاویانەتەوە کە فەرموویانە : (( **موت الفجأة راحة بالمؤمن وأسفٍ على الفاجر**))[١٢٢] . واتە: مردنی لە ناکاو حەوانەوەیە بۆ بڕوادار و نیشانەی تورەبوونە لە خراپکار. ئیمامی عومەر (رضي الله عنه) زۆر جار ئەم دوعایەی دەفەروو: " **اللهم إني أعوذبك ان تأخذني على غِرَّةٍ أو تذرني في غفلة أو تجعلني من الغفلين**"[١٢٣] واتە: خوایە پەنابە تۆ دەگرم لە کوتوپڕدا گیانم بکێشیت یا خود لەبێ ئاگایدا بم هێڵیتەوە یاخود بم خەیتە ڕیزی بێ ئاگاکان.خوای گەورە خۆی بەڵێنی داوە هەر موسوڵمانێك نەخۆش بخات ئەگەر بە نەخۆشی یەکەی بڕوات لە گوناهی خۆش دەبێت وەکو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویّت : لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) گێڕراوەتەوە :((**إذا إبتلى الله العبد المسلم ببلاءٍ في جسده ، قال الله عز وجل اكتب له صالح عمله فإن شفاه غسّلهُ وطهّرهُ،وان قبضه غَفِر له ورحَمَهُ...**))[١٢٤]. واتە : خوای گەورە هەر بەلایەك بدات بەسەر جەستەی موسوڵمانێکدا بە فریشتەکان [ واتە: ئەوانەی کاری چاکە دەنووسن ] دەفەرمویّت کاری چاکەی بنووسن ، وە ئەگەر لەو نەخۆشیە ڕزگاری کردو چاکی کردەوە ئەوا پاکی

---

(١٢١) أخرجه: أحمد في : ((المسند)) (١٧٩٢٤ ـ ١٥٤٩٦) وقال محققه الشيخ الأرناووط اسناده صحيح ، و ابو داود في ((السنن)) (٣١١٠)، والبيهقي في ((السنن الكبرى)) (٣٨٧/٣) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابى داود)) (٢٦٦٧) ، وفي(( المشكاة)) (١٦١١) .

(١٢٢) أخرجه: ابن أبي شيبة ((المصنف )) (٣٧٠/٣) ، والبيهقي ((شعب الأيمان )) (١٠٢١٨)، وأحمد (١٣٦/٦) وقال محققه : اسناده ضعيف ، وقال العجلوني في (( كشف الخفاء)) : رواه أحمد البيهقي باسناده صحيح ، وضعفه الشيخ الألباني مرفوعاً في (( ضعيف الجامع )) (٥٨٩٦).

(١٢٣) أخرجه: ابن أبي شيبة (( المصنف )) (٢٩٥٠٨) ، و أبونعيم (( الحلية )) (٦٥/١).

(١٢٤) أخرجه : احمد في ((المسند)) (١٤٨/٣) ، وحسنه الشيخ الألباني في: ((الصحيح الجامع)) (٢٥٨) .

دەکاتەوە لە هەموو گوناهێك، وە ئەگەر بەو نەخۆشی یەوە ڕۆحی کێشا ئەوا لێی خۆش دەبێت و ڕەحمی پێ دەکات کەواتە: نەخۆش بوونمان پێش مردنمان بە چەند ڕۆژێك سوپاسێکی بێ پایانی بۆ خوای خۆمانی تێدایە لە هەموو ڕوویەکەوە ... لەبەر ئەوە موسوڵمان پێویستە پێش ئەوەی گیانی بگاتە قوڕقوڕاگەی تەوبە بکات چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی : ((ان الله ليقبل توبة العبد مالم يُغَر غِر))[١٢٥]. واتە: خوای گەورە تەوبە لە بەندە کەی وەردەگرێت ئەگەر ڕۆحی نەگەیشتبێتە قوڕقوڕاگەی . بۆیە پێویستە پەنا بگرێت لە شەڕی شەیتان لەو کاتەدا وەکو پێغەمبەر(ﷺ) لە دوعاکانیدا پەنای بە خوا گرتووە لە چەند فروفێڵێکی شەیتان ، وە دەفەرموێت : ((اللهم إني أعوذ بك ...وأعوذ بك أن يتخبطني الشيطان عند الموت))[١٢٦].واتە: خوایە پەنا بە تۆ دەگرم کە شەیتان ڕێگەم لێ هەڵەبکات و سەرم لێ تێك بدات پێش مردنم .وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە لە (**عطاء کوڕی یاسرەوە** ) (رضي الله عنه) کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((**مامن مؤمن يموت ... وأقرب ما يكون عدو الله منه ذلك الساعة**)) [١٢٧] واتە : نزیکترین کات کە شەیتان لە باوەڕدارەوە نزیکە ئەو کاتەیە کە لە سەرەمەرگ دایە ئەویش بۆ ئەوەی ڕێگەی لێ هەڵەبکات لە کاتی مردندا و ڕێگە ئیسلامی لە بیربەرێتەوە، وە سەرقاڵی بکات بە شتی ترەوە بۆ ئەوەی تۆبە نەکات پێش ڕۆح دەرچوونی ، یاخود بەوە کە گومانی خراپ بخاتە دڵیەوە کە خوا تۆ دەیخاتە دۆزەخەوە و ڕەحمی پێ ناکات بۆ ئەوەی گومانی خراپ ببات بە خوای خۆی و گومانەکەی بێتە دی و وای لێ بکات کە کوفرێك یان گوناهێکی پێ بکات یان هاوتا بۆ خوا بڕیاردانێکی پێ بکات و بیکاتە دوا کردەوەی لە دونیادا چونکە وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((**إنما الاعمال بخواتيمها**)) واتە : هەموو کردەوەکان بە کۆتاییەکانیانەوە بەندن . خوای گەورە پەنامان بدات لە شەیتان پێش ڕۆح کێشان کە ڕێگەمان لێ هەڵەبکات . کەواتە تەوبە کردن و داواکردنی لێ خۆش بوون لە خواو پاشان پەنا گرتن بەخوا لە شەیتان وە زۆر وتنەوەی دوا ووشەی (**لاإله إلاّ الله**) و خۆ ئامادەکردن بۆ

---

(١٢٥) أخرجه : ابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٥٣) وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٣٠) .

(١٢٦) أخرجه: النسائي في((السنن)) : (٨٢/٨) ، وأبو داود في ((السنن)) : (١٥٤١) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) : (٥١٠٤) ، وفي : ((صحيح سنن أبي داود)) : (١٣٨٨) و((صحيح الجامع)) : (١٢٨٢) .

(١٢٧) أخرجه:الحارث بن أبي أسامه في ((مسنده)) بإسناد جيد كما قال العلامه السيوطي في ((شرح الصدور))(ص :٢٤).

گه‌ڕانه‌وه بۆلای خوا وه‌ك پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌فه‌رموێت : (( **لقنوا موتاكم قول لاإله الا الله**))[١٢٨] .واته: ئه‌وانه‌ی وا له‌سه‌ره‌مه‌رگدان با له‌دواتانه‌وه وشه‌ی ( **لا إله الا الله** ) بڵێنه‌وه. گرنگی ئه‌م ووشه‌یه‌ش ئه‌وه‌یه وه‌ك پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌فه‌رموێت: : ((**من كان آخر كلامه لا إله الا الله دخل الجنة**))[١٢٩] واته: هه‌ركه‌سێك دوا ووشه‌ی ( **لا إله الا الله** ) بێت ده‌چێته به‌هه‌شته‌وه و ڕزگاری ده‌بێت له ئاگر.

وه‌هه‌روه‌ها له فه‌رموده‌یه‌كی تردا ده‌فه‌رموێت هه‌ر كه‌سێك له نه‌خۆشی سه‌رمه‌رگدا بڵێت: (( **لا إله الا الله والله اكبر لا إله إلا الله وحده لاشريك له ، له الملك وله الحمد لا إله إلا الله ولاحول ولا قوة إلا بالله**)) گه‌ر له‌و نه‌خۆشیه‌دا بمرێت ئاگر نای سوتێنێت))[١٣٠] .

وه هه‌روه‌ها پێویسته له سه‌رمه‌رگدا مرۆڤ دڵخوش بێت به مردن و گه‌یشتن به خوای خۆی ، **سه‌عیدی كوڕی عبدولعه‌زیز** ده‌فه‌رموێت :" بیلال (رضي الله عنه) له‌سه‌ره مه‌رگدا بوو ، خێزانه‌كه‌ی ده‌یوت : ئه‌ی هاوار له موصیبه‌ته! بیلالیش ده‌یفه‌رموو : " **[واطرباه] غدا ألقي الأحبة محمداً وحزبَه**" [١٣١] . واته: ئای له‌و خۆشیه سبینێ به خوشه‌ویستانم ده‌گه‌م موحه‌مه‌د (رضي الله عنه) وه‌هاوه‌ڵه‌كانی .

**موعازیش** (رضي الله عنه) له‌سه‌ر مه‌رگدا ده‌یفه‌رموو : " **مرحباً بالموت ، مرحباً زائرٌ مُغب حبيبٌ جاء على فاقة اللهم انك تعلم أني كنت أخافُك فانا اليوم أرجوك ، إني لم أكن أحب الدنيا و طول البقاء فيها لكري الأنهار ولالغرس الأشجار ولكن لظمأ الهواجر و مكابدة الساعات و مزاحمة العلماء بالرّكب عند حلق الذكر**"[١٣٢]. واته: پێشوازیت لێ بێت ئه‌ی مردن ، پێشوازیت لێ بێت ئه‌ی میوانی دره‌نگ هاتوو ئه‌ی خۆشه‌ویستی كاتی هه‌ژاری ، خوایه خۆت ده‌زانیت من له تۆ ده‌ترسام ئه‌مرۆش من هیوام به تۆیه ، من دونیام خۆش نه‌ده‌ویست

(١٢٨) أخرجه : ابوداود (٣١١٧) ، وصححه الشيخ الألباني في (( صحيح أبي داود)) (٢٦٧٤).

(١٢٩ ) أخرجه: ابوداود (٣١١٦)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٦٤٧٩) ، و((صحيح أبي داود)) (٢٦٧٣).

(١٣٠) أخرجه : الترمذي (٣٤٣٠) ، وابن ماجة (٣٧٩٤) ، وصححه اشيخ الألباني في ((صحيح بن ماجة )) (٣٠٦١).

(١٣١) أخرجه: ابن ابي الدنيا ((المحتضرين)) (٢٩٤) .

(١٣٢) أخرجه: ابن أبي شيبة (( المصنف )) (١٠٨٧٦) ، وأحمد ((الزهد)) (١١٦/٢) ، وابن أبي الدنيا (( المحتضرين )) (١٢٧) ، وأبو نعيم (٢٩٣٩/١) ، وابن قدامة (( الرقة و البكاء )) (١٢٧) و قال محققه : رجاله ثقات.

وەمانەوەم نەدەویست تیایدا بۆ ئاوداشتن و درەخت ڕواندن بەڵکو تەنها بۆ تونیەتی ڕۆژ وناڕەحەتی بردنە سەری کاتەکان و شان ئەژنۆ جووت کردن لەبەردەم زاناکاندا لە کۆڕی زاست و زکردا.وە لە پێش ڕوح دەرچوونی جار جار دەبورایەوە و دەهاتەوە هۆش خۆی و دەیووت: " **ربي اخنقني خنقك فوعِزَّتِك إنَّك لتعلم إني لأحبكَ**"(١٣٣). واتە: خوایە گیان بە خنکاندنی خوت بم خنکێنە سوێند بە شکۆمەندیت خۆت دەزانیت کە من زۆرم خۆش دەوێت .

وە( **محمدی کوڕی واسع** )یش (رحمه الله ) لە سەرەمەرگدا دەیفەرموو: " **مرحباً بملائكة ربي ولاحول ولاقوة الا بالله**" (١٣٤). واتە: پێشوازی و بەخێرهاتنت دەکەم ئەی فریشتەکانی خوا پێویستە مرۆڤ بترسێت لە بێ بروایی سەرەمەرگ .

**ئیمامی ( مجاهد )** (رحمه الله) دەفەرموێت: " **ما من ميّت يموت الاّ مُثِّلَ له جلساؤه ، قال: فاحتضر رجل فقيل : قل لا اله الا الله . قال شاهك**"(١٣٥). واتە: هەرمردوویەك بمرێت لە سەرەمەرگدا هاونشین و هاوشێوەکانی خۆی دەهێنرێتە پێش چاوی ، جارێك بەیەکێکیان ووت : لە سەرەمەرگدا بوو بڵێ (**لا اله الا الله**) . بەم ئەو هەر دەیووت : بەڵێ گەورم .(واتە: ئەو گەورەیەی لە دونیادا خزمەتکاری کردووە).

**ڕبیعی کوڕی موڕە** (رحمه الله) دەفەرموێت: " پیاوێکم بینی لە شاری ئەهواز لە سەرەمەرگدا بوو پێیان دەووت : بڵێ (**لا اله الا الله** ). ئەو هەر دەیووت : دەشانزە ، و چواردە ، و دوانزدە ، (واتە: یاری تاوڵەو دۆمینەی زۆر کردوە لە ژیانیدا ) وە پیاوێکی ترم بینی لە شام لە سەرەمەرگدا بوو پێیان دەوت بڵێ (**لا اله الا الله**) ئەو هەر دەیووت : شەراب تێکە و بەشی هەمووان بدە. و ابن ابی رواد (رحمه الله) دەفەرموێت : "بە پیاوێکیان ووت لە سەرەمەرگدا بوو: بڵێ ( **لا اله الا الله**) ، بەڵام ئەو دەیووت : من کافرم بڕوام بەوە نیە" (١٣٦) .

---

(١٣٣) أخرجه: ابن سعد (٥٨٨/٣) ، وابو نعيم (( الحلية )) (٨١٢/٢) ، و ابن أبي الدنيا (( المحتضرين )) (١٢٨) ، و ابن الجوزي (( صفة الصفوة)) (٥٠١/١).

(١٣٤) أخرجه: ابن ابي لدنيا (( المحتضرين )) (٢٠٠).

(١٣٥) أخرجه: ابن ابي لدنيا (( المحتضرين )) (٢٤٥).

(١٣٦) أخرجه: ابن ابي لدنيا (( المحتضرين )) (٢٤٨،٢٥٠).

# ئه‌و خاكه‌ی كه ئاده‌میزادی له‌سه‌ر ده‌مرێت و ده‌نێژرێت

بێ گومان خوای گه‌وره شاردوێتی یه‌وه له ئاده‌میزاد و خستوێتی یه یه‌كێ له‌و شتانه‌ی كه نادیاره ((غیب)) وه خوا خۆی نه‌بێت كه‌س نایزانێت: ﴿... وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿٣٤﴾﴾ (لقمان: ٣٤) واته: هیچ كه‌سێك نازانێت له چ زه‌وی و خاكێك ده‌مرێت وه ده‌بێت بچێته ناو چ گۆڕێكه‌وه ؟ .

پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ده‌فه‌رموێت : (خوای گه‌وره پێنج شتی بۆ به‌نده كه‌ی بڕاندۆته‌وه ((**من أجلهِ ومن عمله ومن رزقه ومن أثره ومن مضجعه**))[١٣٧] واته:كاتی مردنی و كرده‌وه‌كانی و ڕزقه‌كه‌ی و دوا جێگه كه ده‌بێت پێی بگات و كام خاكیش كه ده‌بێت لاشه‌كه‌ی تیایدا بنێژرێت... بۆیه پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) بۆمان ڕوون ده‌كاته‌وه ، گه‌ر خوای گه‌وره ویستی ڕۆحی ئاده‌میزادێك بكێشێت شتێكی بۆ ده‌ڕه‌خسێنێ له‌و شوێنه‌دا بۆ ئه‌وه‌ی بگاته ئه‌وێ و ڕۆحی تیادا بكێشێت ، پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌فه‌رموێت:((**إذا كان أجل أحدكم بأرض أثبت الله له إليها حاجة ((فإذا بلغ اقصى أثره)) قبضه الله اليه ، فتقول الارض يوم القيامة: يارب هذا ما أستودعتني...**))[١٣٨] واته : گه‌ر دواماوه‌ی ته‌مه‌نی یه‌كێك له ئێوه له جێگه‌یه‌كدا بێت خوای گه‌وره كارێكی زۆر پێویستی بۆ ده‌خاته ئه‌و جێگه‌یه بۆ ئه‌وه‌ی له‌وێ ڕۆحی بكێشێت ، ئه‌گه‌ر گه‌یشته ئه‌وێ ڕۆحی ده‌كێشێت و له ڕۆژی قیامه‌تدا خوای گه‌وره ئه‌و خاكه ده‌یهێنێته وه‌ڵام و به‌رامبه‌ر به‌خوای گه‌وره ده‌ڵێت: خوایه ئائه‌مه بوو كه به‌منت سپاردبوو ، وه له كوێدا مردبوو هه‌ر له‌وێدا زیندوو ده‌بێته‌وه له قیامه‌تدا وه‌ك پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌فه‌رموێت : ((........ **حتى**

---

(١٣٧) أخرجه : أحمد في((المسند)) (١٩٧/٥) ، وابن أبي عاصم في ((السنة)) (٣٠٣) ، وقال محققه الشيخ الألباني: حديث صحيح .

(١٣٨) أخرجه : ابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٦٣) ، والطبراني في ((الكبير)) (١٠٤٠٣) ، والحاكم في ((المستدرك)) (٣٦٧/١) و صححه ووافقه الذهبي ، والبزار في ((المسند)) : (٢٩١/١) ، وابن أبي عاصم في ((السنة)) (٣٩٢) ، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٢٢٢) ، وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٣٨) وفي ((صحيح الجامع)) (٧٤٥) ، وفي ((ظلال الجنة)) (٣٩٢)) .

**یبعثه الله من مضجعهِ ذلك))**[١٣٩]. واتە: تا خوای گەورە هەر لەوێدا زیندووی دەکاتەوە. گرنگی (**بأي أرض تموت**) ئەبێ نهێنی ئەم مەسەلەیە لە کوێدا بێت ؟ کە ئێمە نەزانین کام خاك بە نسیبمان دەبێت هۆکەشی ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : ((**دفن في الطينة التي خُلق منها**))[١٤٠]. واتە: (هەموو کەس دەبێت بچێتەوە ئەو خاکەی کە یەکەم جار ئەو لاشەیەی لێ ی درووست کراوە)...

لەئەبو سەعیدەوە (رضي الله عنه) دەفەرموێت: (پێغەمبەر(ﷺ) بەلای جەنازەیەك لای گۆڕێکەوە دانرابوو تێپەڕی ، و فەرمووی ((ئەمە گۆڕی کێ یە؟)) ووتیان ئەوە فلان کەسی خەڵکی حەبەشەیە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، پاشان پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : (**لاإله إلا الله**) (وەکو سەر سوڕمانێك) (( **سيق من أرضيه وسمائه إلى تربته التي منها خُلق** )) واتە :خوای گەورە لەژێر پەردەی ئاسمانەکەی و لەسەر ڕووی زەویەکەی هێنای بۆ ئەو جێگەیەی کە یەکەم جار ئەو لاشەیەی ئەوی لێ دروست کراوە و(کرایە ناویەوە) [١٤١] کەواتە : ئەگەر لاشەی هەر موسوڵمانێکی بەڕێز لە خۆڵی هەر دۆڵێکدا دروست کرابێت، دەبێت بچێتەوە ناو ئەو دۆڵە . (ابن عباس)یش (رضي الله عنه) دەفەرموێت : " **يُدفَنُ كل إنسان في التربة التي خُلق منها** " [١٤٢] واتە: هەموو کەسێك دەنێژرێت لەو خاکەی کە لێی دروست کراوە. وەهەروەها دوور کەوتنەوەمان و بەغەریبی مردنمان و دوا جێگە کە خوا بە نسیبمان بکات بەڵکو ئەویش هەر ڕەحم و بەرەکەت بێت بۆمان .

لە عەبدولای کوڕی عەمروە (رضي الله عنه) دەفەرموێت : پیاوێك لە ئەنصارە بەڕێزەکانی خەڵکی مەدینە کە هەر لەوێ لە دایك بووبوو هەر لەو شارە مرد ، پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی لەسەر کرد و فەرمووی ((**ياليته مات فى غير مولده**)) خۆزگە لەو شوێنەی کە تیایدا لە دایك بوو لەوێ نەدەمرد ، یەکێك لە هاوەڵەکان فەرمووی بۆچی؟ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ((**إن الرجل**

---

(١٣٩) أخرجه : ابن حبان (( الصحيح )) (٣١١٧) وقال محققه : اسناده قوي ، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٧٢٤).

(١٤٠) أخرجه: الحاكم (٣٦٧/١) وصححه ووافقه الذهبي ، وحسنه الشيخ الألباني في (( الصحيحة)) (١٨٥٨).

(١٤١) أخرجه : الحاكم في ((المستدرك)) (٣٦٧/١) و صححه ووافقه الذهبي ، والبيهقي في((شعب الإيمان)) (٩٨٩١)، وحسنه الشيخ الألباني لطرقه في ((السلسلة الصحيحة)) (١٨٥٨).

(١٤٢) أخرجه : عبد الرزاق (( المصنف))(٦٥٣).

إذا مات في غير مولده قيسً لـه مـن مولـده الى منقطـع أثـره في الجنـة)) (١٤٣) واتـه: ئەگـەر ئادەمیزاد لەو جێگەیەدا بمرێت کە دوورە لەو جێگەیەی کە تێیدا یەکەم جار لە دایـك بـووە ، ئـەوا لەوێوە تا دوا شوێنی کە پێی گەیشتووە بۆی دەپێورێت لە بەهەشـت دا . کەواتـە تـا دوورتـر بمرین لەو جێگەیەی کە لێ ی لە دایك بووین دەبێتە خێر و پاداشت و ڕەحمەت بۆمان .

## ڕۆح کێشان

پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بەووردی دیمەنەکانی سەرتا سەری گیان کێشان و تا دوا جێگەی کە پێی دەگەین ، بۆی ڕوون کردوینەتەوە وە گرنگترین ئەو فەرموودانە کە (صحیح)ن ، فەرموودەکەی (براء)ە کە دەفەرموێت : (ڕۆیشتین لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ جەنازەیەکی ئەنصاریەك دا (واتە : پیاوێك لە پیاوانی خەڵکی مەدینەمان دەبرد بۆ گۆڕستانی (بەقیع) ) ، و گەیشتینە لای گۆڕەکە و تەماشامان کرد هێشتا گۆڕیچەکەی بۆ دروست نەکراوە لەبەر ئەوە جەنازەکەمان دانا و پێغەمبەر(ﷺ) ((دانیشت بەرەو ڕووی قیبلە)) و ئێمەش لە چوار دەوری کۆبووینەوە زۆر ماتەمینی و ئارامیمان پێوە دیار بوو وە بێ جووڵە بووین هەر وەکو بەردێك یان دارێك کە کۆترێك بەسەری یەوە بنیشێتەوە نەئەجولاینەوە لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وە پێغەمبەریش(ﷺ) یش چیلکەیەکی بە دەستەوە بوو خەتی پێ دەکێشا((ئینجا سەیری ئاسمانی کردو دوای ئەوە تەماشای زەوی کرد وە فەرمووی پەنا بگرن بە خوا لەسزای گۆڕ[سێ جار لێ ی دووبارە کردینەوە ])) وە پاشان فەرمووی خوای گەورە پەنا بە تۆ دەگرم لە سزای گۆڕ [سێ جار دوو بارەی کردەوە] پاشان فەرمووی ((إن العبد المؤمن إذا كان في إنقطاع من الدنيا وإقبال من الأخرة)) .واتە : بەندەی خاوەن باوەڕ کاتێ ڕوی کردۆتە قیامەت و دابڕاوە لە دنیا لە ڕیوایەتێکی تردا ... ((إن المؤمن إذا إحتضر)) (١٤٤)واتە : کاتێ گیان کێشانی باوەڕدار دێت

---

(١٤٣) أخرجه : ابن ماجة في ((السنن)) (١٦١٤) ، والنسائي في ((السنن)) (٤/٧) وفي ((السنن الكبرى)) (١٩٥٨) ، وأحمد في ((المسند)) (٢/١٧٧) ، وابن حبان في((الصحيح)) (٢٩٣٤) وقال محققه إسناده حسن ،و حسنه الألباني كذلك في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (١٣٠٩) ، وفي ((صحيح سنن النسائي)) (١٧٢٩) ، وفي ((المشكاة)) (١٩٥٣) ، وفي ((صحيح الجامع)) (١٦١٦) .

(١٤٤) في رواية : النسائي في((السنن)) (٤/٨) ، والحاكم في ((المستدرك)) (١/٣٥٢) ، صححه ووافقة الذهبي، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (١٧٢٩) ، وفي (السلسلة الصحيحة)) (١٣٠٩) .

کۆمەڵە فریشتەیەك لە ئاسمانەوە دێنە خوارەوە بۆلای لەسەرەمەرگدا ((...نزل إليه [ترأت له))[١٤٥] خۆیانی پێ نیشان دەدەن وە ئەو کەسە واتە مردووەکە دەیان بینێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾ (الواقعة: ٨٥) .واتە : فریشتەکانی ئێمە لەوە وە نزیکترن لە ئێوە بەلاّم ئێوە نایانبینن وە ئەو فریشتانەش ((...ملائكة [الرحمة]))[١٤٦] فریشتەی بەبەزەیی و میهرەبانن (کە لەوە دەچێت وەکو میوانێك پێشوازی و بەخێرهاتنی بکەن) ...((..من السماء بيض الوجوه كأن وجوههم الشمس معهم كفن من أكفان الجنة [بحريرة بيضاء]))[١٤٧]وە ئەو فریشتانە لە ئاسمانەوە دێنە خوارەوە و ڕووسپین وە ڕوویان وەکو خۆر ڕووناکە کفنێکیان پێ یە لە کفنەکانی بەهەشت وە بۆنێکی خۆش ((فيها مسك وضبائر ريحان))[١٤٨]واتە: بۆنی میسکی بەهەشتە لەناو ئاوریشمێکی سپی دایە .... ((وريحان من ريحان الجنة))[١٤٩] لەگەڵ هەندێك ڕەیحانە لە ڕەیحانەکانی بەهەشتە ... ((حتى يجلسوا منة مد البصر فيقولون...)) دێن دادەنیشن لە چوار دەوری دا تا چاو بڕیکات [ژمارەیان چەند زۆرە ؟ لە فەرموودەیەکی (**ضعيف**) دا هاتووە ژمارەیان (٥٠٠) کەسە بەلاّم زۆر لەو ژمارەیە زیاترن ئەویش بە گوێرەی پلەی خاوەن باوەڕەکەیە تەنها خوا خۆی دەزانێت] ئەو فریشتانە دێن و دەڵێن (السلام عليكم ) وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ ۙ يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمُ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ (النحل: ٣٢ ) پاشان دەڵێن ....(أخرجي أيتها النفس الطيبة ، كانت في الجسد الطيب أخرجي حميدة) ... واتە:

---

(١٤٥)في رواية :الطبراني في ((الأحاديث الطوال)) (٢٥) ، توضيح على كلمة ((ترآت له)) وهؤلاء الملائكة لايراهم الحاضرون حول الميت وإنما يراه الميت أو المحتضر كما قال تعالى ﴿ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾ (الواقعة: ٨٥) (وعند ذلك ينقطع معرفة المحتتصر بالناس في الدنيا كما قال ابوموسى الأشعرى (ﷺ) : " إذا عاين الميت الملك) ذهبت المعرفة و (يعني معرفة الناس) " اخرجه : عبد الرزاق (( المصنف)) (٦٠٦٨)، وانظر : ((طائف المعارف)) لابن رجب (ص: ٤٦١)

(١٤٦) أخرجه: النسائي في ((السنن)) (٨/٤) ، والحاكم في ((المستدرك)) (٣٥٢/١) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣٠١٣) .

(١٤٧) في رواية: النسائي والحاكم وابن حبان .

(١٤٨) في رواية :البزار في ((المسند)) رقم (٨٦٢).

(١٤٩) في رواية: الطبراني في ((الأحاديث الطوال)) ، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (٣٢٩/٢) ، رواه الطبراني ورجاله ثقات

وەرە دەرەوە ئەی ڕۆحی پاك لە جەستەی پاك دا بوویت [کەواتە پاك بۆ پاکە ئەگەر ڕۆح پاك بێت ئەوا لاشەکەش پاکە (الطيبون للطيبات)] ((راضية مرضية عنك وأبشري)) وەرە دەرەوە بەختەوەر بە و ڕازیکراو ببەو خواش لێت ڕازی یە ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾﴾ (فصلت: ٣٠) واتە : فریشتەکان دێنە خوار بۆلای وەکو وەفدێك بۆ ئەوەی نەترسێت ، کە دێنە خوارەوە پێ ی دەڵێن بە یەك دەنگ : ترست نەبێت کە ئێستا چی دێتە ڕێت وە هیچ خەفەتت نەبێت لەو ماڵ و منداڵەی کە جێ ی دەهێڵیت لە دوای خۆت ، خەمت نەبێت ئێمە لە ژیانی دنیادا لە پشتان بووین لە دوای مردنیش هەر لە پشتانین پاشان پێ‌ی دەڵێن :[ بروح ((الله)) وريحان ورب غير غضبان ((فلايزال يقال لها ذلك حتى تخرج))](١٥٠). واتە: مژدە بێت بە ڕەحمی خوای گەورە بۆت وە بەڕیحانەی بەهەشت وە خوایەك کە تووڕەنی یە لێت .بەردەوام ئەو وتانەی پێ دەوترێت [بۆ ئەوەی نەترسێت ] تا ڕۆحی دەردەچێت وە کو خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿فَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ الْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾﴾ (الواقعة: ٨٨-٨٩) واتە : ئەگەر پیاو چاکان بن ئەوا دەدرێت بە گوێیانداو پێیان دەوترێت لە پێش گیان کێشانیان دا بۆ ئەوەی ترسیان لێ بڕەوێتەوە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ((ثم يجيء ملك الموت عليه السلام))(١٥١). واتە : ئینجا فریشتەی گیان کێشان دێت بۆ لای تا لای سەریەوە دادەنیشێت و پێ‌ی دەڵێت ((ئەی ڕۆحی پاکی پڕ ئارام وەرە دەر

---

(١٥٠) أخرجه: النسائي في ((السنن)) (٨/٤)، وفي ((التفسير)) (٤٦٢) وقال محققه حديث صحيح ، وابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٦٢) ، وأحمد في ((المسند)) (٣٦٤/٢)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح النسائي)) (١٧٢٩) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٤٩٠، ١٩٦٨) ، وفي ((السلسلة الصحيحه)) (١٣٠٩) ، وفي ((مادل عليه القرآن)) (ص: ٤٤).

(١٥١) كان ملك الموت يأتي الناس عياناً يرونه قبل ذلك عن أبى هريره مرفوعاً : (( كان ملك الموت يأتي الناس عياناً فاتى موسى فلطمه ففقا عينه فاتى ربه عز وجل)) أخرجه: أحمد في ((المسند)) (٥٣٣/٢)، ،والبزار في ((المسند)) (٨٥٦) ، و عبدالرزاق في ((المصنف)) (٢٠٥٣٠) ، وقال الهيثمي في : ((مجمع الزوائد)) (١٣٧٨٣) رواه أحمد والبزار ورجاله رجال الصحيح ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٢١٧١) ، و ((مختصر العلو)) (٢١٠) ، وفي ((السنة)) لابن ابي عاصم (٨٠١) ، وكذلك صححه الحاكم على شرط مسلم في ((المستدرك)) (٥٨٧/٢) ، واللفظ لأحمد، وانظر معنى الحديث في : ((فتح الباريء)) (٤٤٢/٢) و((شرح السنة)) للبغوي (٢٦٨/٥).

بۆلای ڕازی بوون و لێ خۆش بوونی خوا)) ڕۆحەکەش دێتەدەر و دەڕژێت وەك چۆن دلۆپێك ئاو لە دەمی کونەی ئاو یاخود (مەتارە) ئاوێك دەڕژێت و دێتە خوار.

لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : [((وەکو چۆن تاڵە موویەك لە ناو هەویردا بە ئاسانی دەهێنرێتەدەر ئاوا)) ڕۆحەکە بە ئاسانی دێتە دەرەوە)] [١٥٢]،لەگەڵ ئەوەش دا موسوڵمان کە ئەو کۆمەڵە فریشتەیەدێن بۆ لای ، وە فریشتەی گیان کێشان کەمژدەی دەداتێ ئەو ئادەمیزادە بەڕێزە مردنی پێ خۆشە چونکەچوون بۆ لای خوای پێ خۆشە ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (کاتێ خاوەن باوەڕ ، مردن دەگاتە سەری ئەوەی دێت دەیبینێت واتە [فریشتەکانی خوا دەبینێت] ئەو کات زۆر خۆشحاڵە کە زووتر ڕۆحی بچێتە دەر لە لاشەی ، خوای گەورەش گەیشتن بەو بەندەیەی پێ خۆشە)[١٥٣].(خاوەن باوەڕ کە هاتە کاتی سەرە مەرگی و فریشتەکانی بینی و ئەوەی بۆی ئامادە کراوە زۆر کامەرانە و بەپەلەیە کە ڕۆحی لە لاشەی بچێتە دەرەوە وئا لەو کاتەدا هەرکەسێك گەیشتن بەخوای پێی خۆش بێت، خوای گەورەش بەیەك گەیشتنی ئەو بەندەیەی پێ ی خۆشە) [١٥٤].

عائشە (رضي الله عنها) کاتێ کە فەرموودەکەیان بۆ خوێندەوە فەرمووی (کاتێ کە چاو ئەبڵەق دەبێ وە سنگی دەکەوێتە لرخە لرخ، وە لەشی دەکەوێتە لەرزە لەرز و پەنجەکانی ڕق دەبن لەو کاتەدا ((هەرکەس پێی خۆش بێت زوو بگات بە خوا، خوای گەورەش بەیەك گەیشتنی ئەو بەندەیەی پێی خۆشە)) [١٥٥] لە ڕیوایەتێکی تردا ((من أَحَبَ لقاء الله أحَبَ الله لقائهُ)) واتە : هەرکەسێك پێی خۆش بێت بگات بە خوا ئەوا خواش پێی خۆشە ئەو بەندەیەی پێی بگات ، وە هەرکەسێکیش پێی ناخۆش بێت بگات بە خوا خواش پێی ناخۆشە بگات بەو، هاوەڵەکان ووتیان: پێ ناخۆش بوون بەگەیشتن بە خوا لە پێ ناخۆش بوونەبەگەیشتن بە

---

(١٥٢) أخرجه: البزار في ((المسند)) (٨٦٢) .

(١٥٣) أخرجه :عبدالله بن احمد في ((السنة)) (١٣٧٥) ، و البزار في ((المسند)) (٨٧٤) ، وقال السيوطي في ((بشرى الكئيب)) رقم (٦٨) إسناده صحيح ، وحسن إسناده الشيخ الألباني في ((الآيات البينات)) (ص: ١٠٥) ، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (٢٦٢٨) .

(١٥٤) أخرجه: ((عبدالرزاق)) في ((المصنف))(٦٧٤٩) وسنده صحيح كما قال محقق ((بشرى الكئيب)) رقم (٣٥) .

(١٥٥) أخرجه : أحمد (٨٥٥٦) وقال محققه : إسناده صحيح على شرط مسلم ، النسائي في ((السنن الكبرى)) (١٩٦٠)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (١٧٣٣) .

مردن ، وە هەمووشمان مردنمان پێ ناخۆشە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (نەخێر ئەوە نی یە کە ئێوە تێی گەیشتوون بەڵکو ئەوە لەکاتی سەرەمەرگ دایەکاتێك مژدەی بەزەی و لێ خۆش بوون وبەهەشتی خوای پێ دەدرێت ، ئەو بەندەیەش گەیشتن بەخوای پێ خۆشە)) لە ڕیوایەتێکی تردا: ((فليس شيءٌ احب إليه من ان يكون قد لقى الله عز وجل)) [١٥٦]((فأحب الله لقاءهُ)) [١٥٧] واتە : هیچ شتێك نی یە پێی خۆشتربێت لە گەیشتن بە خوای خۆی ، وە خوای گەورەش زۆر پێی خۆشە کە ئەو بەندەیەی پێی بگات .

**ڕوونکردنەوەیەك: ((ئایا ڕۆح لە کوێ وە دەردەچێت؟))**:-

ئادەمیزادی خاوەن باوەڕ بەڵێ ڕۆحی لە سەریەوە دەردەچێت لەم لاو ئەو لای تەنیشتی یەوە ، وەکو پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : ((ان المؤمن تخرجُ نَفسَهُ من بين جنبيه وهو يحمُد الله عز وجل)) [١٥٨]. واتە : خاوەن باوەڕ ڕۆحی لەنێوان هەردوولا شانی یەوە بەرز دەبێتەوە ،و لەو کاتەش دا سوپاسی خوا دەکات ... پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : ((إنَّ نفس المؤمن تخرج رشحاً)) [١٥٩].واتە: ڕۆحی خاوەن باوەڕ بە ئارەقکردنەوە دەردەچێت ، لە ڕیوایەتێکی تردا ...... پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : ((ألمؤمن يموت بعرق الجبين)) [١٦٠]. واتە : خاوەن باوەڕدەمرێت و ئارەق لە ناوچەوانیەوە دەتکێت: ئیمامی بەغەوی (رحمه الله) دەفەرموێت : ((عرق الجبين))

---

(١٥٦) أخرجه: أحمد في ((المسند)) (١٠٧/٣) برقم (٢٤٢٨٤) وقال محققه اسناده على شرط مسلم ، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (٣٢٠/٢) رواه أحمد .. ورجال أحمد رجال الصحيح .

(١٥٧) أخرجه: النسائي في ((السنن الكبرى)) (١٩٦٤) ، وابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٦٤) ، وابن حبان في الصحيح (٣٠١٠) وقال محققه : اسناده صحيح على شرطها ،وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٣٩).

(١٥٨) أخرجه: النسائي في ((السنن)) (٢٦١/١)، وأحمد في ((المسند)) (٢٧٣/١) رقم (٢٤١٢) وقال محققه الارناؤوط: حديث حسن ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (١٧٣٩)، وفي ((صحيح الجامع)) (١٩٣)، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (١٦٣٢) ، وفي ((مختصر الشمائل المحمدية)) (٢٧٩) .

(١٥٩) أخرجه: الطبراني في ((المعجم الكبير)) (١٠٤١٧)، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (٣٢٣/٢) رواه الطبراني و إسناده حسن .

(١٦٠) أخرجه: الترمذي في ((السنن)) (٩٨٢) وقال : حديث حسن ،والنسائي في ((السنن الكبرى)) (١٩٥٥) ، والحاكم في ((المستدرك)) (١٦١/١)، وصححه و ابن حبان في ((الصحيح)) (٣٠١١) وقال محققه إسناده صحيح على شرط البخاري، واحمد في ((المسند)) (٣٥٠/٥) ، وابن ماجة في ((السنن)) (١٤٥٢) وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (١٧٢٥) ، وفي :((صحيح السنن ابن ماجة)) (١١٨٨) وفي ((المشكاة)) (١٦١٠)، و في ((صحيح سنن الترمذي)) (٧٨٤) .

واتە بە ناڕەحەت گیانی دەکێشرێت لەو کاتەدا چونکە لەوە دەچێ خاوەن باوەڕ چەند گوناهێکی ما بێت بۆیە ئاوا بە ناڕەحەت گیانی دەکێشرێت و عارەقی لێ دەتکێت .. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە خوای گەورە ویستبێتی بیکاتە بری ئەو گوناهانەی ئەو کەسە کردوویەتی)(١٦١).

ئەگەر ڕۆح دەرچوو چاو بە دوایدا دەڕوانێت وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە ، لە ئوم سەلەمەوە (رضي الله عنها): دەفەرموێت : (ئەبی سەلەمە نەخۆش بوو کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو لای ئێمە هات .. ئەبی سەلەمە چاوی ئەبلەق بوبوو بەرەو ئاسمان ، کە گیانی دەرچوو پێغەمبەر(ﷺ) چاوی داخست و فەرمووی : ((ان الروح اذا قُبضَ تَبعَهُ البصرُ)) واتە : ڕۆح دەرچوو چاویش بە دوای دا دەڕوانێت ئەنجا کە ئەوەی فەرموو هەندێ لە خزمانی ئەبو سەلەمە ناڕەحەت بوون و دەنگیان لێ بەرزبوەوە.، پێغەمبەر(ﷺ)) فەرمووی : ((**لا تدعوا على أنفسكم الا بخير فان الملائكة يؤمِّنون على ما تقولون**)) ... واتە : دوعای خراپ لە خۆتان مەکەن تەنها دوعای چاك بۆ خۆتان بکەن چونکە فریشتە ئامادەبووەکان لەو کاتەدا ئامین دەکەن، دوای ئەوە فەرمووی : ((**اللهم اغفر لأبي سلمة وارفع درجته في المهديين واخلفه في عقبه في الغابرين واغفر لنا وله يارب العالمين وافسح له في قبره ونور له فيه**))(١٦٢). واتە : (خوایە لە ئەبی سەلەمە خۆش ببە وە پلەی بگەیێنە بە (**المهديين**) وە خوایە شوێنەکەی بۆ دوای خۆی پڕ بکەرەوەو لە ئێمەو لەویش خۆش ببە وە خوایە گۆڕەکەی بۆ فراوان بکە و بۆی ڕووناك بکەرەوە) .

## (( ڕوونکردنەوەکە تەواو بوو ))

ئێستا دەگەڕێینەوە بۆ فەرموودەکەی (براء) ئەوە بوو فریشتەی گیان کێشان هات و مژدەی پێدا) و....(**فيأخذها**) ... گیانی دەکێشێت پاشان یەکسەر لە چاو ترووکانێکدا فریشتە کان

---

(١٦١) البغوي في ((شرح السنة)) (٥/٢٩٧) ، وفي رواية عن ابن مسعود (ﷺ) قال : (( موت المؤمن عرق الجبين ، إنَّ المؤمن تبقى خطايا من خطاياه يجازى بها عند الموت فيعرق من ذلك جبينهُ)) . أخرجه: أحمد بن منيع و مسدد باسناد صحيح – كما قال البوصيري في ((اتحاف الخيرة المهرة)) (٢٥١٩،٢٥١٧).

(١٦٢) أخرجه :أحمد في ((المسند)) (٦/٢٩٧) ،ومسلم في ((الصحيح)) (٢١٢٧) ،وابن ماجة في ((السنن)) (١٤٥٤)، والبيهقي في ((الكبرى)) (٣/٣٣٤) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (١١٨٩) ، وانظر : ((المسند المستخرج)) (٢٠٦١) .

دەیخەنە ناو کفنە(بۆنخوشە) سپی یەکەوەکە پڕە لە میسك ورەیحان پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((فتخرج كأطيب ريح مسك [وجدت على وجه الأرض] ))[١٦٣] واتە : ڕۆحەکە کاتێك دەردەچێت بۆنی زۆر خۆشترە لە بۆنی بۆنخۆشترین میسکێك کە لەسەر زەویدا هەبێت [بۆیە عائیشە (رضي الله عنها)دەفەرموێت (کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد بۆنێکی زۆر خۆش لە ژوورەکەیدا بلاّو بۆوە)][١٦٤] ئەفەرموێت : هەتا دەری دەکەن ڕۆحەکەی ئەو باوەڕدارە خۆی بۆنی خۆشە و کفنەکەش بە هەمان شێوە بۆنی خۆشە لەبەر ئەوە کە ڕۆحەکە دەردەهێنرێت ...((حتّى إنه ليتناوله بعضهم بعضاً يشمّونه))[١٦٥] واتە : فریشتەکان دانە بە دانە ئەو ڕۆحە ئەوەندە بۆنی خۆشە بەیەکتری دەدەن و بۆنی دەکەن ئینجا دەفەرموێت ... ئالەو کاتەدا ئەو ڕۆحە کە چووە دەستی ئەو فریشتانەوە هەموو فریشتەی زەوی و ئاسمان دوعای خێری بۆ دەکەن وە داوای پلەی بەرزی بۆ دەکەن وە هەموو دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوە و لێ پرسراوانی دەرگاوانەکانی ئاسمان خۆزگە دەخوازن و داوا دەکەن لە خوای گەورە کە ئەو ڕۆحە پاکە لە ڕێ ی ئەوانەوە ((بەرەو ژوور بچێت بەرەو ئاسمان))[١٦٦]، پاشان ئەی کەنە ئەو کفنە سپی یە بۆنخۆشە و تێوەی دەئالێنن [واتە چۆن دەبێت لاشەکە کفنی سپی بێت ، ڕۆحەکەش کفنەکەی ئاوریشمی سپی یە ] خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿...تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾﴾ (الأنعام :٦١). واتە: فریشتەکانمان ڕۆحی دەکێشن وە هەرگیز کەمتەرخەمی ناکەن لە چۆنی یەتی ڕۆح کێشان و پاراستنی ئەو ڕۆحە وەك خوای گەورە مەبەستێتی ((هەتا دەیگەیەننە ئاسمان)) [١٦٧] فریشتەکان زۆرن (( کە ئەوان تێدەپەڕن بەلایاندا وە بەرز دەبنەوە و ڕۆحەکەشیان پێ یە هەر پۆلە فریشتەیەکیان پێ دەگات ئەو پۆلانە دەڵێن:

---

(١٦٣) في رواية : أحمد في ((المسند)) (٢٧٨/٤).

(١٦٤) أخرجه:أحمد (٢٤٩٠٥) وقال محققه:اسناده صحيح على شرطهما، وصححه أيضاً ابن كثير في ((البداية))(٢٤١/٥).

(١٦٥) أخرجه : النسائي في ((السنن)) (٨/٤) ، والحاكم في (( المستدرك )) (٣٥٢/١) وصححه ووافقه الذهبي ، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح سنن النسائي) (١٧٢٩) ، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (١٣٠٩) .

(١٦٦) في رواية : الطياليسي في ((المسند)) (٧٥٣)) .

(١٦٧) أخرجه : الحاكم في ((المستدرك)) (٣٥٣/١) وصححه ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣٠١٣)، وقال محققه الأرناؤط: إسناده صحيح على شرطهما.

... ئەم ڕۆحە پاکە بۆن خۆشە کێ یە ؟ ئەوانیش دەڵێن فلانی کوڕی فلانە[١٦٨] بە چاکترین ناوێك کە لە دنیادا ناو برابێت تابەرزی دەکەنەوە بۆ ئاسمانی یەکەم))[١٦٩] ئەو پاسەوانانە پرسیاردەکەن کە پاسەوانانی ئاسمانی یەکەمن لە ڕوایەتێکدا ((دەفەرموون ئەم بۆنە خۆشە چی یە لە زەوی یەوە هات ؟))[١٧٠] (( بۆنی هەرگیز وامان نەدیوە لەمە خۆشتر))[١٧١] [ لە دواییدا ((دەرگای ئاسمانی لێ دەکرێتەوە بۆ ئەو نەفسە پاکەپاشان پێی دەوترێت: ئەمە کێ یە ؟ ئەوانیش دەڵێن فلانی کوڕی فلانە، وە ئەوان پێی دەڵێن: سلاو لە نەفسە پاکە کەلەناو جەستەی پاك دا بوو ، (خوا پایە بەرزت بکات خۆت و ئەو لاشەیەی کە تێیدا کردەوەی چاکت پێ دەکرد لە ژیانی دنیادا)) فەرموو وەرە ژوورەوە تۆ سوپاس کراوی (( مژدەت لێ بێت بەئارامی وە بەریحانەی بەهەشت وە بەخوایەك کە لێت بە تووڕەنیە وە بەردەوام ئەوەی پێ دەڵێن))...][١٧٢] هەتا بە ڕێی دەکەن و ئەو ڕۆحە بەرەو ئاسمانی دووەم دەبەن و ئاسمان بە ئاسمان بەرزی دەکەنەوە تا دەیگەیەنە ئاسمانی حەوتەم فریشتە نزیکە بەرێزەکانی ئەو ئاسمانانە وای پێ دەڵێن))[١٧٣]. ((هەتا ئەو ڕۆحە دەگەیەننە ئاسمانی حەوتەم لە ڕیوایەتێکی تردا [ هەتا دەیگەیەنە ئەو ئاسمانەی ] کە خوای گەورەی لێ یە))[١٧٤] [١٧٥].

لە ڕیوایەتێکدا : (کە بەرز دەکرێتەوە بۆ لای خوای گەورە فریشتەکان (کە لێپرساوی نووسینی کردەوەکانی ئادەمیزادن لە دنیادا ، کە (رقیب و عتیدن)) دەڵێن : خوای گەورە ئەوە

---

(١٦٨) ئەوەی کە دەڵێن بە ناوی دایکی یەوە بانگی دەکەن هەڵەیەو ڕاست نی یە ئەمە فلانی کوڕی فلانە.

(١٦٩) وفي رواية : ابن حبان في ((الصحيح)) (٣٠١٣).

(١٧٠) وفي رواية : ابن حبان في ((الصحيح)) (٣٠١٤) وقال محققة الأرناوؤط إسنادة صحيح .

(١٧١) في رواية : ابن حبان في ((الصحيح)) (٣٠١٣)) .

(١٧٢) أخرجه : الحاكم في ((المستدرك)) (٣٥٢/١) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣٠١٤) وقال محققة الشيخ الأرناوؤط : إسناده صحيح .

(١٧٣) إخرجه : إحمد (٢٩٥/٤) ، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (٤٦/٣) و رجال أحمد رجال الصحيح.

(١٧٤) أخرجه : ابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٦٢) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٣٧) ، وفي (مادل عليه القرآن) (ص :٤٤) ، وفي ((المشكاة)) (١٦٣٧) .

(١٧٥) أخرجه : النسائي في ((التفسير)) رقم (٤٦٢) وقال محققه إسنادة صحيح ، وابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٦٢) ، وأحمد في ((المسند)) (٣٦٤/٢) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٩٦٨) ، وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٣٧).

فلآن بەندەی تۆیە ...)[١٧٦] خوای گەورەش دەفەرمویت : ناوی ئەم بەندەیەم بنوسن لە (عليين) کە ((لە ئاسمانی حەوتەم))ە [١٧٧].[ وە بیگەڕیننەوە بۆ سەر زەوی چونکە من بەڵێنم پێ داون کە لە زەوی دروستم کردوون وە دەیانگێڕمەوە بۆ ناو زەوی وە لە زەویشەوە زیندوویان دەکەمەوە] ، دیسان ڕۆحەکە بەو شوێنانەی پێیدا ڕۆیشتووە دەهێنرێتەوە بۆ سەر زەوی بۆ ناو لاشەکەی)[١٧٨]....(لێرەدا دەوەستین) .

## ((ڕوون کردنەوەیەك))

مردوەکە خوای گەورە هەست و هۆشێکی دەداتێ ،و دەزانێت کێ دەیشوات و کێ هەڵی دەگرێت و کێ شۆڕی دەکاتەوە ناو گۆڕەکەی – عبد ڕحمانی کوڕی ئبین و ئەبی لەیلێ دەفەرمویت:" ڕۆحی مردووەکە بەدەست فریشتەیە و پێ ی دەڵێن لە کاتی شۆردن و هەڵگرتنی لەسەر شان گوێ بگرەچۆنت باس دەکەن و چیت پێ ی دەڵێن". [١٧٩]

وەشێخ (مشهور بن حسن)یش دەفەرمویت : " مردوو ئاگای لێ یە کێ دەی شوات و کێ کفنی بۆ دەکات و کێ بەرەو گۆڕستانی دەبات" [١٨٠] بێگومان فریشتە بەڕێزەکان کە بە (وەفد) چوون لە گەڵیدا دیسان ئەمانیش بە وەفد دەگەڕێنەوە لە گەڵیدا وەك لەمژدەی بڕوادار دا ووتیان: ﴿ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ...﴿٣١﴾ ﴾ (فصلت: ٣١) واتە: ئێمە پیشتیوانتانین لە ژیانی دونیا وەلە کۆتایشدا. ئەم لاشەیە دەگەیەننە دوا شوێن وەکو خۆیان فەرموویانە. ئەگەر موسوڵمانێکی بەڕێزیش خوای گەورە بۆی ڕێك نەخات بشۆرێت فریشتەکان

---

(١٧٦) في روايه :أحمد في ((المسند)) (٢٩٦/٤) .

(١٧٧) ئەویش کتێبێکە هەموو ژمارەی بەهەشتیەکانی تێدایە لە ئادەمەوە هەتا کۆتا هەمین کەسی بەهەشتی ناوی تۆمار دەکرێت لە ناو تۆمارگەی (ئەهلی بەهەشت) وەك خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَـٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ﴿١٩﴾ كِتَـٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٢٠﴾ يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ (المطففين:١٨-٢١) .أخرجه : ابن أبى شيبه في ((المصنف)) (١٢٠٨٥) ، والبيهقي في ((شعب الإيمان)) (٣٩٥) وقال صحيح الإسناد .

(١٧٨) دیارە ڕۆحەکە وەکو بەنجکراوە ئاگای لە چوار دەور هەیە بەڵام ناتوانێت هیچ بڵێت وە هێچ وەڵام بداتەوە.

(١٧٩) أخرجه: عبد الرزاق ((المصنف )) (٦٢٥٥).

(١٨٠) أنظر: حاشية (بشرى الكئيب) (ص: ٥٤) ، وقد ورد ذلك في حديث ضعيف ن أبي سعيد (ﷺ) مرفوعاً: (( إنَّ الميّتَ يعرِفُ من يحملُهُ ومن يَغسلُهُ ، ومن يُدَلّيه في قبرِه)). اخرجه: أحمد (١٩٩٧) وقال محققه: اسناده ضعيف.

دەیشۆرن لە ئیبن عەباسەوە (رضي الله عنه)دەفەرمویت : پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : (رأيت الملائكة تغسل حمزة بن عبدالمطلب وحنظلة الراهب) [١٨١] واتە : فریشتەکانم بینی حەمزەو حەنزەلەیان دەشت ، چونکە هەردووکیان شەهید بوون وە لەش گران بوون. شەهیدیش نابێت بشۆرێت بەلاّم فریشتەکان ئەوانیان شۆرد ، پاشان ئەو فریشتە بەرێزانە ئامادەی بەرێکردنی ئەو جەنازەیە بۆ سەر گۆڕستان دەبن وە نوێژی لەسەر دەکەن لەگەل خەلّکدا.

ئیبن و عەباس (رضي الله عنه) لە ڕوونکردنەوەی ووشەی فریشتەکان کە ووتیان ( نحن أولیائكم) دەفەرمویت : (إن المؤمن إذا حضره الموت شهدته الملائكة فسلموا عليه وبشروه بالجنة فإذا مات مشوا مع جنازته ثم صلوا عليه مع الناس)[١٨٢] واتە : کاتێك کە باوەڕدار لەسەرە مەرگدایە فریشتەکان ئامادە دەبن و سلاّوی لیّ دەکەن و مژدەی بەهەشتی پیّ دەدەن ، وەکاتێك کە گیانی دەرچوو لە گەلّ جەنازەکەیدا دەڕۆن و نوێژیشی لەسەر دەکەن لەگەلّ خەلّکیدا . ئیتر ئەو کەسە پلەی باوەڕی خۆی دەبێتە هۆی زۆر و کەمی ژمارەی ئەو فریشتانەی کە ئامادەی نوێژو بەرێکردنی تەرمەکەی دەبن بۆ سەر گۆڕستان و تەرمەکەشی لەگەلّ خەلّکیدا هەلّدەگرن.

سەعدی کوڕی موعاز (رضي الله عنه) حەفتا هەزار فریشتە لەگەلّ جەنازەکەیدا بوون. سەعد پیاوێکی بالاّ بەرز و گەورە و قورس بوو ، ووتیان ئەم جەنازەیە بۆ ئەوەندە سووکە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ((إنَّ الملائكة كانت تحمله [ معهم] ))[١٨٣] واتە: ئەوە فریشتەکان هەلّیان گرتبوو لەگەلّیاندا. فریشتە دۆستی موسولّمانە وە موسولّمانەکەش باش دەزانێت بۆ کویّ ی دەبەن وە چی بۆ ئامادە کراوە لە گۆڕەکەیدا ، ئەوە لەبەر چاوی من و تۆ گۆڕێکی تەسکە بەلاّم باخچەیەکی یەکجار خۆشی بەهەشتە ... پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویت : ((إذا

---

(١٨١) أخرجه: الطبراني في ((الكبير)) (١٢٠٩٤) ، والبيهقي في ((السنن الكبرى)) (١٢/٤)، وفي ((الدلائل)) (٢٤٦/٣)، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (٢٣/٣) ورواه الطبراني وإسناده حسن ، وحسن إسناده ايضا الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٣٤٦٣) .

(١٨٢) أنظر : ((تفسير القرآن العظيم)) لابن كثير (٣٧٣/٣) ، وأخرجه ابن أبي حاتم والبيهقي .

(١٨٣) أخرجه : أحمد (٢٣٤/٣)، ومسلم (٢٤٦٧) ،والترمذي (٣٨٤٩) ، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٣٣٤٧).
وفي رواية (( لقد نزل لموت سعد بن معاذ سبعون ألف ملك ماطئوا الأرض قبلها )) . أخرجه : البزار (٢٦٩٨) ، وصححه الشيخ الألباني في (( الصحيحة))(٣٣٤٥) . وفي رواية أخرى (( هذا الذي تحرك له العرش و فتحت له أبواب السماء و شهدهُ سبعون الفاً من الملائكة ...)) أخرجه: ابن حبان (٧٠٣٣) وقال محققه: اسناده حسن.

وضعت الجنازة وإحتملها الرجال على أعناقهم فإن كانت صالحة قالت : قدموني ، قدموني....)) [١٨٤] واته: كه لاشه‌ی مردووه‌كه كرایه ناو دارمه‌یته‌وه و پیاوان له‌سه‌ر شان هه‌ڵیانگرت به‌ره‌و گۆڕستان ئه‌گه‌ر پیاو چاك بێت ده‌ڵێت په‌له بكه‌ن په‌له بكه‌ن هێواش مه‌ڕۆن . بۆیه سوننه‌ته به خێرایی بگه‌یه‌نرێته سه‌ر گۆڕستان . دیاره ئاگای لێ یه كێ ده‌یخاته ناو گۆڕه‌كه بۆیه ده‌بێت لای قاچیه‌وه بكرێته ناو گۆڕه‌كه‌وه و بوترێ (بسم الله وعلى ملة رسول الله (ﷺ)) دوای ئه‌وه خۆڵی به‌سه‌ردا ده‌كرێت ، پاشان چۆن تۆ له‌ژێر بانێكدا له سه‌ره‌وه ته‌په ته‌پ بێت گوێت لێ یه به‌هه‌مان شێوه ئه‌ویش گوێی له ته‌په‌ی پێڵاوی ئه‌وانه وه‌كو پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی : (هه‌ركاتێك ئه‌و كه‌سه كرایه ناو گۆڕه‌وه ئه‌وا .... إنه يسمع قرع نعالهم))[١٨٥] واته : مردووه‌كه گوێ ی له ته‌په‌ی پێ ی نه‌عله‌كانیانه كه ده‌ڕۆن و به جێ ی ده‌هێڵن .... لێره‌دا پرسیارێك دێته پێشه‌وه ئایا یه‌كسه‌ر پرسیاره‌كه‌ی لێ ده‌كرێت یان دوای تۆزێكی تر ؟.

پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ڕوونی كردۆته‌وه‌و له فه‌رمووده‌كه‌ی ئه‌نه‌سه‌وه(رضي الله عنه)كه ده‌فه‌رموێت : ((إن المؤمن إذا وضع في قبره أتاه الملك فيقول له : ماكنت تعبد...)) [١٨٦] واته : بڕوادار هه‌ر كرایه ناو گۆڕه‌كه‌یه‌وه فریشته‌كه دێت و خێرا پرسیاری لێ ده‌كاتو پێ ی ده‌ڵێت : چیت ده‌په‌رست ؟ . و في رواية : ((إذا قبر الميت أتاه ملكان أسودان...)) [١٨٧] واته : ئه‌گه‌ر مردوو كرایه ناو گۆڕه‌كه‌یه‌وه دوو فریشته‌ی ڕه‌ش دێنه ناو گۆڕه‌كه‌یه‌وه .... له عوسمانه‌وه (رضي الله عنه) ده‌فه‌رموێت (ئه‌گه‌ر پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) له ناشتنی مردوویه‌ك ته‌واو بوایه‌له سه‌ری ده‌وه‌ستاو ده‌یفه‌رموو: ((إستغفروا لإخيكم وسلوا لهُ التثبيت فإنه الآن يسأل))) [١٨٨] واته : داوای لێ

---

(١٨٤) أخرجه: البخاري في ((الصحيح)) (١٣١٤) .

(١٨٥) أخرجه : النسائي في ((السنن)) (٩٦/٤) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (١٩٣٦) ، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (١٣٤٤).

(١٨٦) أخرجه : أبو داود في ((السنن)) (٤٧٥١) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٩٣٠) .

(١٨٧) أخرجه: الترمذي في ((السنن)) (١٠٧١) ، وحسنهُ الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٣٩١) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٧٢٤) ، وفي ((ظلال الجنة)) : (٨٦٤) .

(١٨٨) أخرجه: أبو داود في ((السنن)): (٣٢٢١) ، والحاكم في ((المستدرك)) (٣٧٠/١) . والبيهقي في ((الكبرى)) (٥٦/٤) ، وصححه االشيخ الألباني في ((أحكام الجنائز)) (ص: ١٩٨)) ،وفي ((صحيح الجامع)) (٩٤٥).

خۆش بوون بکەن لە خوا بۆ ئەم برایەتان و داوای بۆ بکەن دامەزراوی بکات چونکە ئێستا ئەو پرسیاری لیٚ دەکرێت. بەڵام لە هەندێك فەرموودەی تردا هاتووە کە دوای ئەوەی خەڵکەکە دەوری چۆڵ دەکەن و دەڕۆن ئینجا فریشتەکان پرسیاری لیٚ دەکەن ، پیٚ دەچێت ئەوەش بە گوێرەی پلەی بەندایەتی کردن و تەقوا بێت ، ئەگەر ئەو کەسە پلەی بەرز بێت لای خوا ئەوا لە نێو خەڵکەکەدا پرسیارەکەی یەکسەر لێدەکرێت بۆ ئەوەی نەترسێت و هیچ ناڕەحەت نەبێت ، بەڵام ئەگەر تۆزێك گوناح باربێت واز دێنن تاکو خەڵکەکە دەڕوات ئینجا دێنە سەری تاکو کەفارەتی گوناهەکانی بێت بە بەڵگەی فەرموودەکەی ئەنەس (رضي الله عنه) کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: ...(ئەو کەسە کاتێك کە کرایە ناو گۆڕەکەی...((**وتوّلی عنه اصحابه حتى إنه ليسمع خفق نعالهم أتاه ملكان**))(١٨٩) واتە : کەس و کارەکەی بە جێیان هێشت هەتا گویٚ ی لە دەنگی پێڵاوەکانیان دەبێت پاشان دوو فریشتەکە دێن بۆ پرسیار لیٚ کردنی ، وە لە دەقی فەرموودەکەی تردا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت : ((**إذا دخل المؤمن قبره و تولى عنه أصحابه جاءه ملكٌ شديدٌ الانتهار**))(١٩٠).واتە:(کاتێك بڕوادار کرایە ناو گۆڕەکەیەوە و کەس و کارەکەی بە جێیان هێشت فریشتەیەکی زۆر تووڕە دێت بۆلای). وە لە ڕیوایەتێکدا : دەفەرموێت ((**إذا الإنسان دفن فتفرق عنه أصحابه جاءه ملك شديد الأنتهار**)) واتە: ئادەمیزاد کە دەکرێتە ناو گۆڕەکەیەوە ، و هاوڕێیانی بلاٚوەی لیٚ دەکەن ، یەکسەر فریشتە دەگاتە سەری.

## (( ڕوون کردنەوە کە تەواو بوو ))

ئینجا دێینەوە خزمەت فەرموودە درێژەکەی (براء) ئەوە بوو ووتمان ڕۆحەکەی دێتەوە ناو لاشەکەی پاشان پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت : ((**أتاه ملكان أسودان أزرقان يقال لأحدهما المنكر و للآخر النكير**))(١٩١).واتە: دوو فریشتەی ڕەشی چاو شین دێن بۆلای یەکێکیان ناوی

---

(١٨٩) أخرجه: البخاري في ((الصحيح)) (١٣٧٤) ، ومسلم في ((الصحيح)) (٧١٤٦) ،وأبو داود في ((السنن)) (٤٧٥٢).

(١٩٠) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (١١٠٠٠) وقال محققه الشيخ الأرناوؤط : إسناده حسن ، وابن أبى عاصم في ((السنة)) (٨٦٥) وقال محققه : حديث صحيح ، وقال ابن كثير في (( التفسير)) (٣/٣٧٠) اسناده صحيح على شرط مسلم ، وصحح اسناده ايضاً السيوطي في (( شرح الصدور )) (ص:١١٣٠) ،و الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (٣٣٩٤).

(١٩١) أخرجه : الترمذي في ((السنن)) (١٠٧١) ، و ابن أبى عاصم في ((السنة)) (٨٦٤) ، وقال محققه الشيخ الألباني إسناده حسن ، والحاكم في ((المستدرك)) (١/٣٠٧) وصححه ووافقه الذهبي ، ابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٧) وقال

(منكر) واتە کەس ناناسێت وە ئەوی تریان ناوی (نەکیر)ە) واتە [کەس نایناسێت] لەبەرئەوە، ئادەمیزاد یەکەمجار بیبینێت نە ئەوان کەس دەناسن تاکو ڕەحمی پێ بکەن وە نەکەسیش دەیاننناسێت ..

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : ((**جاءه ملك في يدهِ مِطراقٌ...**))[١٩٢]. واتە: فریشتەیەك دێت بۆ لای چەکوشێکی بە دەستەوەیە)[١٩٣].

لە ڕێوایەتێکی تردا (شديد الانتهار) ((**ينتهرانه** ،و)) **يجلسانه** ((**فيقال له : اجلس فيجلس**))[١٩٤]. واتە : دوو فریشتەی زۆر توڕەو توندو تیژ دێن بۆ لای [لێرەدا(والله أعلم) بەگوێرەی پلەی بەندەکە دەبێت ئەگەر موسوڵمانێکی لە خوا ترس بێت ئەوا یەك فریشتە دێت وە هەندێك جار دوو فریشتە دێن و پرسیاری لێ دەکەن و نایترسێنن . بەڵام ئەگەر گوناه باربێت دوو فریشتەی ڕەشی چاو شین چەکوشیان پێیە و بۆ ئەوەی بیترسێنن وە لێ ی توڕە دەبن و دایدەنیشێنن ]... لە ڕیوایەتێکی تردا ... پێی دەڵێن : دانیشە ، [کەواتە ئەویش جیاوازدەبێت موسوڵمانە لە خوا ترسەکە لە دوورەوە پێ ی دەڵێن دانیشە ئەویش دادەنیشێت بەڵام ئەوی تریان دایدەنیشێنن بە زۆر]((**فيجلس الرجل الصالح فى قبره غير فزع ولا مشعوف**)[١٩٥]واتە: بەبێ ترس ئەو پیاو چاکە دادەنیشێت لە گۆڕەکەیدا پاشان ((**فيقوم يهب كما يهب**

---

محققه الشيخ الأرناؤط : إسناده قوى ، وحسنه الشيخ الألباني ايضاً في ((صحيح الجامع)) (٧٢٤)، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (١٣٩١) .

(١٩٢) أخرجه : الترمذي في ((السنن)) (١٠٧١) ، وابن أبي عاصم في ((السنة)) (٨٦٤) ، وقال محققه الشيخ الألباني : إسناده حسن ، والحاكم في ((المستدرك)) (٣٠٧/١) وصححه ووافقه الذهبي ، ابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٧) وقال محققه الشيخ الأرناؤط : إسناده قوي ، وحسنه الشيخ الألباني ايضاً في ((صحيح الجامع)) (٧٢٤) وفي ((السلسلة الصحيحة)) (١٣٩١) .

(١٩٣) انظر توضيح ذلك في : ((لوامع الأنوار البهية)) (٧/٢).

(١٩٤) أخرجه : عبدالرزاق في ((المصنف)) (٦٧٠٣) ، والطبري في ((التفسير)) (٢١٥/١٣) ، وابن أبي شيبة في ((المصنف)) (٣٨٣/٣) ، والطبراني في ((المعجم الأوسط)) (٢٦٥١) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٣) وقال محققه الأناوؤط إسناده حسن ، وقال الهيثمي في ((المجمع)) (٥١/٣) رواه الطبراني في ((الأوسط)) وإسناده حسن

(١٩٥) أخرجه: ابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٦٨) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٤٣) وفي ((المشكاة)) (١٣٨٥) .

**النائم))**[١٩٦] واته: ـ هەڵدەستێت وەکو چۆن یەکێك لە خەو ڕادەپەڕێت وە دوایی((**فيجلس يمسح عينيه))**[١٩٧] واته: دادەنیشێت و هەردوو چاوی دەپروێنێت و دەستی پیادێنێت. لە ڕیوایەتێکی تردا ((**وقد مثلت له الشمس وقد أدنيت للغروب))**[١٩٨] واته : وێنەی ڕۆژی نیشان دەدرێت لە کاتی نزیکی ئاوا بوونیدا.........

**((ڕوون کردنەوەیەك))**

لە گۆڕدا بیر و هۆشی خەڵکان دە گەڕێتەوە سەر بیر و هۆشی جارانیان لە دنیادا ، لە عومەری کوڕی خەتابەوە (ﷺ) دەفەرموێت : پێغەمبەر(ﷺ) باسی فریشتەکانی ناو گۆڕی دەکرد کە لە خەڵك دەپرسنەوە وە منیش ووتم : (ئایا ئێمە هەموومان بیرو هۆشمان بۆ دەگەڕێتەوە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : ((**نعم كهيئتك اليوم)**[١٩٩] واته: بەڵێ وەکو شێوەی ئەمڕۆت دەبێت .

**((ڕوون کردنەوە کە تەواو بوو))**

دەگەڕێینەوە خزمەت فەرموودەکەی (براء) لە ڕیوایەتێکی تردا ((ئەگەر باوەڕدار بێت (کردەوەکانی چوار دەوری دەدەن) نوێژ لای سەری یەوە دەبێت ،و ڕۆژوو لای ڕاستی یەوە دەبێت و وە زەکات لای چەپی یەوە دەبێت ،وە کردەوەی چاکەکان وەکو خێر کردن و سەردانی خزم و دۆست و چاکە کردن لەگەڵ خەڵکاندا لای هەردوو قاچی یەوە دەبێت فریشتەکان لەلای سەری یەوە، بۆی دێن ،نوێژ دەڵێت : لە لای منەوە ڕێگە نی یە پاشان لەلای ڕاستی یەوە بۆی دێن ڕۆژوو دەڵێت : لای منەوە ڕێگە نی یە، پاشان لە لای چەپی یەوە بۆی دێن زەکات دەڵێت لای منەوە ڕێگە نی یە،پاشان لە لای هەردوو قاچی یەوە دێن کارە چاکەکانی لە خێر و سەردانی

---

(١٩٦) أخرجه : ابن أبي عاصم في ((السنة)) (٨٦٦) ، وقال محققه الشيخ الألباني : إسناده جيد على شرط البخاري.

(١٩٧) أخرجه : ابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٧٢) ، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٤٧) ، وفي ((ظلال الجنة)) (٨٦٧) .

(١٩٨) أخرجه : ابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٧٢) ، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٤٣) ، وفي ((المشكاة)) (١٣٨٥) .

(١٩٩) إخرجه أحمد : في ((المسند)) : (١٧٩/٢) برقم (٦٦٠٣) وقال محققه: حسن لغيره.، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٥) ، وقال محققه الأرناوؤط إسناده حسن ، وقال السيوطي في ((شرح الصدور)) (ص:١٢٥) إسناده صحيح ، وحسنه الشيخ الألباني في (( صحيح الترغيب)) (٣٥٥٣).

خزم و چاكه كردن له گه‌ڵ خه‌ڵكان ده‌ڵێت لای منه‌وه ڕێگه نی یه —وفی روایه — (**[ يؤتى الرجل في قبره ، فاذا أوتي من قِبل رأسه دفعته تلاوة القرآن ، وإذا أوني من قِبل يديه دفعته الصدقه ، وإذا أوتي من قِبل رِجليه دفعته مشيُه إلى المساجد]**)[٢٠٠] . واته : له ڕیوایه‌تێكی تردا ده‌فه‌رموێت : ((فریشته دێته لای ئه‌و كه‌سه له گۆڕه‌كه‌یدا ، ئه‌گه‌ر لای سه‌ریه‌وه بۆی هاتن، خوێندنی قورئان ڕێگریان لێ ده‌كات ، وه ئه‌گه‌ر لای هه‌ر دوو ده‌ستیه‌وه هاتن ، خێر وچاكه ڕێگریان لێ ده‌كات ،وه ئه‌گه‌ر لای قاچه‌كانیه‌وه بۆی هاتن ، ڕۆیشتنه‌كانی بۆ مزگه‌وته‌كان ڕێگریان لێ ده‌كات )) پاشان پێ ی ده‌وترێ دانیشه ئه‌ویش داده‌نیشێت))[٢٠١] وه هه‌ردووكیان پێی ده‌ڵێن واته: (نكير و منكر) : خوات كێ یه ؟ ئه‌ویش ده‌ڵێت په‌روه‌ردگارم ((الله)) یه ، پاشان پێ ی ده‌ڵێن ئایینت چی یه ؟ ئه‌ویش ده‌ڵێت ئایینم ((ئیسلام))ه ، له ڕیوایه‌تێكی تردا (پێی ده‌وترێت چیت په‌رستووه ؟ئه‌گه‌ر خوا ڕێنموویی بكات ده‌ڵێت : من ((الله))م په‌رستووه)[٢٠٢] ، ئینجا پێی ده‌وترێت ئایا ئه‌و پیاوه‌ی كه ((نێرراوه)) بۆ ناوتان چی ده‌ڵێی له باره‌یه‌وه وه چ شاهیدی یه‌ك ده‌ده‌ی له‌سه‌ری ؟ ئه‌ویش ده‌ڵێت لێم گه‌ڕێن با نوێژ بكه‌م ئه‌وانیش پێی ده‌ڵێن : تۆ له‌مه‌ودوا نوێژ ده‌كه‌یت به‌ڵام (( وه‌ڵامان بده‌ره‌وه سه‌باره‌ت به‌وانه‌ی كه پرسیارت لێ ده‌كه‌ین ئه‌ویش ده‌ڵێت سه‌باره‌ت به چی پرسیارم لێ ده‌كه‌ن ؟ ئه‌وانیش ده‌ڵێن پێمان بڵێ چی ده‌ڵێیت له باره‌ی ئه‌و پیاوه‌وه كه نێررا بۆناوتان چ شاهیدیه‌ك ده‌ده‌ی له‌سه‌ری؟))[٢٠٣] له ڕیوایه‌تێكی تردا : ((ئه‌وه‌ی كه ووتویه‌تی هه‌ر ئه‌وه وه‌ڵام ده‌داته‌وه))[٢٠٤] ((**فيقول : محمد هو عبدالله ورسول**))...ده‌ڵێت محمد (ﷺ) به‌نده‌ی خوایه وه(**اشهد ان لا إله إلا الله وان محمداً عبده ورسوله**)[٢٠٥] وه شاهیدی ده‌ده‌م كه هیچ خوایه‌ك نی یه ته‌نها

---

(٢٠٠) اخرجه : الطبراني في (( الأوسط )) (٣٢٥١) ، والحاكم (٣٧٩/١) وصححه ووافقه الذهبي ، وقال الهيثمي في ((المجمع)) (٥١/٣) : اسناده حسن ، وحسنه الشخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٣٥٦١).

(٢٠١) في رواية : ابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٣) ، وقال محققه : إسناده حسن .

(٢٠٢) أخرجه :أحمد في ((المسند)) (١٣٤٤٧) ، وقال محققة الأرناوؤط حديث صحيح وهذا إسناد قوى ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٩٣٠) .

(٢٠٣)أخرجه:ابن حبان في ((الصحيح))(٣١١٣)،والطبراني في((المعجم الأوسط))(٢٦٥١)،والحاكم في ((المستدرك))(٣٧٩/١)

(٢٠٤) في رواية : الترمذي في ((السنن)) (١٠٧١) ، وفي ((الصحيح الجامع)) (٧٢٤) للشيخ الألباني .

(٢٠٥) في رواية : الترمذي في ((السنن)) (١٠٧١) .

(الله) نه‌بێت وه محمدیش (ﷺ) به‌نده‌و نێرراوی خوایه. ((جاءنا بالبينات والهدى فاجبناه وآمنا به))[٢٠٦] واته: ڕێگای بۆ ڕوون كردینه‌وه‌و ڕێنمویی كردین ئێمه‌ش باوه‌ڕمان پێ هێناوه گوێڕایه‌ڵیمان كرد (( وأتبعناه فيقال له : صدقت))[٢٠٧] وه شوێنیشی كه‌وتین پێی ده‌وترێت ((واته نكير ومنكر)) پێی ده‌ڵێن : ڕاستت كرد (قد كنا نعلم أنك تقول ذلك)[٢٠٨] واته: ئێمه ده‌مان زانی كه تۆ هه‌روا ده‌ڵێیت ... له ڕیوایه‌تێكدا (قد علمنا إنك كنت لمؤمنا)[٢٠٩] واته: ئێمه هه‌ر زانیمان كه تۆ باوه‌ڕ دار بووی ... (ئینجا پێی ده‌ڵێن ئه‌مانه‌ت چۆن زانی ؟ ده‌ڵێت كتێبه‌كه‌ی خوام خوێنده‌وه و باوه‌ڕم پێ هێنا و به ڕاستم دانا ((پێ ی ده‌وترێت ئایا خوات بینیوه ؟ ئه‌ویش ده‌ڵێت بۆ كه‌س نی یه خوای گه‌وره ببینێت ] [ واته: له دنیادا ]))[٢١٠] ئینجا لێی تووڕه ده‌بن و ڕای ده‌وه‌شێنن و پێی ده‌ڵێن : په‌روه‌ردگارت كێ یه؟ ئایینت چی یه؟ پێغه‌مبه‌رت كێ یه؟ وه ئه‌مه‌ش دوا فیتنه‌یه( واته: دوا تاقیكردنه‌وه‌یه) كه دێته پێش باوه‌ڕ دار

**(( ڕوون كردنه‌وه‌یه‌ك ))**

وا دیاره له‌م فه‌رمووده‌یه‌وه ـ والله أعلم ـ كه ئه‌م ئومه‌ته باوه‌ڕدارو خراپه‌كارو دوو ڕووه‌كان سه‌رجه‌م به‌رپرسیار لێكردنی ناو گۆڕ ده‌كه‌ون جگه له كافرو ئومه‌ته‌كانی تر[٢١١]. كه‌واته پرسیار كردن ته‌نها بۆ ئومه‌تی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌بێت (والله أعلم)، وه به‌ڵگه‌ش بۆ ئه‌مه فه‌رمووده‌كه‌ی زیده (رضي الله عنه) كه له پێغه‌مبه‌ره‌وه(ﷺ) ده‌یگێڕێته‌وه وده‌فه‌رمووێت:

(ان هذه الأمة تبتلى في قبورها..)[٢١٢]واته: ئه‌م ئومه‌ته تاقی ده‌كرێنه‌وه له‌گۆڕه‌كانیاندا، وه هه‌روه‌ها فه‌رمووده‌كه‌ی عائشه (رضي الله عنها) له پێغه‌مبه‌ره‌وه (ﷺ) ده‌فه‌رموێت :

---

(٢٠٦) أخرجه : الإمام مالك في ((الموطأ)) (١/١٨٨) ، والبخاري في ((الصحيح)) (٧٢٨٧) ، ومسلم في ((الصحيح)) (٩٠٥) ، واحمد في ((المسند)) (٦/٣٤٥) .

(٢٠٧) أخرجه : الطبراني في ((المعجم الأوسط)) (٢٦٥١) .

(٢٠٨) أخرجه: الطبراني في ((المعجم الأوسط)) (٢٦٥١) .

(٢٠٩) أخرجه: ابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٤)) ، وقال محققه الشيخ الأرناووط إسناده صحيح على شرط الشيخين .

(٢١٠) أخرجه : ابن ماجة في ((السنن)) : (٤٢٦٨)) ،. وصحح إسناده الحافظ في ((فتح الباری)) (٣/٣٠٥) ، وصححه الشيخ الألباني في (( صحيح سنن ابن ماجة)) : (٣٤٤٣) .

(٢١١) وهو قول الحكيم الترمذي وابن عبدالبر والسيوطي انظر حول الموضوع ((لوامع الأنوار البهية))(٢/١٠) ، و ((شرح لمعه الأعتقاد)) (ص: ٦٨) ، والصنعاني في ((سبل السلام)) (٢/١٥٧) ، و(( الاجوبة المرضية)) للسخاوي (٢/٧٧٩).

(٢١٢) أخرجه: مسلم في ((الصحيح)) (٧١٤٢) .

(وأما فتنة القبر فِبـيَ تفتنون وعني تُسألون ..)[٢١٣] . واته : بەڵام لێپرسینەوەی گۆڕ سەبارەت بە من تاقی دەکرێنەوە و پرسیارتان لیٚ دەکریٚت، وە لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) پەنای بە خوا دەگـرت لـە سـزای گـۆڕ ، لـە فەرموودەکـەی عـروەدا(رضي الله عنه) کـە دەیگێڕێتـەوە لـە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەفەرمووێت : (**اللهم انی اعوذ بك من فتنة القبرو أعوذبك مـن عـذاب القبر**)[٢١٤] . واته:(خوایە پەنا بە تۆ دەگرم لە تاقیکردنەوەی ناو گۆڕوە لـە سـزای گـۆڕ) وە لـە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێت : ((**وأعوذ بك من فتنة المحيا والممات** ))[٢١٥] واته: خوایە پـەنا بە تۆ دەگرم لە تاقی کردنەوەی ژیان و مردن ..

## ((ڕوون کردنەوەکە تەواو بوو))

دەگەڕێینەوە بۆ فەرموودەکەی (براء) : پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: لەبـەر ئەوەیـە کـە خـوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿ **يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأَخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾** ﴾ (ابراهيم :٢٧) . واته: (خـوای گـەورە باوەڕداران دامەزراو دەکات بە ووتەی ڕاست و ڕەوا لە دنیاو قیامەتدا) . لە ڕیوایـەتێکی تـردا (**فما يسأل عن شيء غيرها**)[٢١٦] . واته : ئیتر پرسیاری سەبارەت بە هیچی تر لیٚ ناکرێت .

((**فينادى مناد من السماء : أنْ صدق عبدي ، فافرشوه من الجنة ،و البسوه مـن الجنـة ، وأروه منزله من الجنة**))[٢١٧] واته : بانگ کارێك بانگ دەکات لە ئاسمانەوە : بەندەکەم ڕاستی کرد بۆی ڕاخەن لە فەرشی بەهەشت وە پۆشاکی بەهەشتی بەبەردا بکەن و جێگەی خۆی نیـشان بدەن لە بەهەشتدا ..((**وافتحوا له بابا الى الجنة ، قال : فيأتيه من روحها وطيبها ، ويفسح له في قبره مدَ بصره**)). وە دەفەرموێت : دەرگایەکیش بۆ بخەنە سەر بەهەشت ، وئیتر بۆنی خـۆش و شنەی بای بەهەشتی پیٚ دەگات وە گۆڕەکەشی بۆ فراوان دەکرێت تا چاو بڕ بکات ،**وفي رواية**

---

(٢١٣) أخرجه :أحمد في ((المسند)) (١٤٠/٦)، وحسنه الشيخ الألباني في ((الصحيح الجامع)) (١٣٦١) .

(٢١٤) أخرجه: البخاري في ((الصحيح)) (٦٣٧٦) .

(٢١٥) أخرجه :البخاري في ((الصحيح)) (٦٣٦٧) .

(٢١٦) أخرجه: أبو داود في ((السنن)) (٤٧٥١)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٩٣٠) .

(٢١٧) أخرجه :الحاكم في ((المستدرك)) (٣٨/١٠) .

((ثم يفسح له في قبره سبعون ذراعا في سبعين ذراعـا ، وينـور لـه فيـه))[(٢١٨)] واتـه : پاشـان گۆڕەکەی بۆ فراون دەکرێت حەفتا گەز بە حەفتا گەز وە بۆی ڕووناك دەکرێتەوە. ((كالقمر ليلة البدر))[(٢١٩)] . وەك مانگ لە شەوی چواردەدا ((و يملأ عليه خضرة [و في رواية : إن المؤمن في قبره لفي روضة خضراء])).[(٢٢٠)] واتە: وە گۆڕەکەی پڕ لە سەوزایی دەکرێت . لە ڕیوایەتێکی تردا : باوەڕدار لە گۆڕکەیدا لە باخێکی سەوزدایە ((إلى يـوم يبعثـون))[(٢٢١)] . واتـه : تـا ئـەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێتەوە . (([ويأتيه] وفي رواية :[يتمثل له] رجل حسن الوجه حسن الثياب طيب الريح فيقول: أبشر بالذى يسرك أبشر برضوان من الله وجنات فيها نعيم مقيم)) واته: پیاوێکی ڕوخسار جوان و پۆشاك جوان و بۆن خۆشـی نیـشان دەدرێـت و دێـت بـۆلای و پـێی دەڵێت : مژدە بێت بە لێ خۆش بوونی خوا وە بەهەشتێکی خۆش کە نیعمـەتانێکی نـەبڕاوەی تێدایە ، ((فيقول له وأنت فبشرك الله بالخير)) من انت ؟ فوجهك الوجه الذي يجيء بالخير؟ فيقول أنا عملك الصالح ((فوالله ماعلمتك إلا كنت سريعاً في طاعة الله بطيئاً في معصية الله، فجزاك الله خيراً)) واته : (ئا ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە پەیمانت پێ درابـوو، وە بڕوادارەکـەش پـێی دەڵێت ((تۆش خوا مژدەی خێرو خۆشیت بداتێ)) تۆ کێیت ؟ ڕوخسارت ڕوخساری یەکێکە کە چاکەی پێ بێت؟ ئەویش دەڵێت : من کردەوە چاکەکانی تۆم سوێند بە خوا ئەوەندەی من تـۆم ناسی بێت زۆر خێرا بوویت لە چاکە کردن و گوێڕایەڵی خـوادا و سـست بوویـت لـە سەرپێـچی کردنی خوای گەورە دا ، خوا پاداشتی چاکەکانت بداتەوە.

پاشان دەفەرمووێت : ((ثم يفتح له باب إلى النار ((فينظر إليها يحطم بعـضها بعـضا))[(٢٢٢)] واته: ئەو بـڕوادارە دەرگایـەکی بـۆ دۆزەخ بـۆ دەکرێتـەوەو شـوێنە تایبەتیەکـەی کـە بـۆی

---

(٢١٨) أخرجه: الترمذي في ((السنن)) (١٠٧) وابن أبي عاصم في ((السنة)) (٨٦٤) وقال محققه الشيخ الألباني حديث صحيح ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٧) وقال محققه :إسناده قوى ، وصححه الشيخ الألباني أيضاً في ((صحيح سنن الترمذي)) (٧٥٦) وفي ((صحيح الجامع)) (٧٢٤) .

(٢١٩) أخرجه: الطبري في ((التفسير)) (٢٢٣٣) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣١٢٢) وقال محققه إسناده حسن .

(٢٢٠) في رواية : ابن حبان في ((الصحيح)) (٣١٢٢) .

(٢٢١) أخرجه: البخاري في ((الصحيح)) (١٣٣٨) ، ومسلم في ((الصحيح)) (٢٨٧٠) .

(٢٢٢) أخرجه: أحمد في ((المسند)) (١٤٠/٦) ، وابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٦٨) وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٤٣) .

ئامادەکراوە نیشان دەدرێت و تەماشا دەکات چۆن ئاگرەکان بەناویەکدا دەچن و کڵپە دەسێنن ((وە پێی دەوترێت ئائەوە جێگەی تۆ بوو لە دۆزەخ))[٢٢٣] کە بۆت دابین کرابوو) گەر سەرپێچی خوات بکردایە یاخود ((کافر بوویتایە)) [٢٢٤].[ **فیزداد غِبطةً وسرورا** ][٢٢٥]. واتە : بڕوادارەکە زیاتر خۆشحاڵ و کامەران دەبێت کە خوای گەورە ئەو جێگە ناخۆش و ناڕەحەتەی لێ بە دوور خستووە پاشان پێ ی دەوترێت :(( **فإما إذا أمنت[ واطعت ربك وعصي عدوّك ] [ عصمك الله ورحمك فابدلك به بيتاً في الجنة]** [٢٢٦]))[٢٢٧]. واتە: بەڵام کە بڕوادار بوویت خوای گەورە ڕەحمی پێ کردیت و تۆی پاراست و ئەو جێگەیەی بۆ گۆڕیت بە خانوویەك لە بەهەشتدا )) ((**فيراهما جميعاً**)) [٢٢٨]. واتە: ((هەردوو جێگەکە بە چاوی خۆی دەیبینێت)) .

**(( ڕوون کردنەوەیەك ))**

پێغەمبەر(ﷺ) ڕوونی کردۆتەوە کە لە گۆڕدا بەیانی و ئێوارە هەیە وە هەموو بەیانی و ئێوارەیەکیش موسوڵمان شوێنەکەی خۆی ڕۆژی (٢) جار نیشان دەدرێت ، وە هەروەها کافریش نیشانی دەدرێت تاکو ڕۆژی قیامەت وەکو ئیبن و عومەر (رضي الله عنه) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە دەفەرموێت : ((**إن أحدكم إذا مات عرض عليه مقعده بالغداة والعشي ، إن كان من أهل الجنة فمن أهل جنة ، وإن كان من أهل النار فمن أهل النار يقال : هذا مقعدك حتى يبعثك الله إليه يوم القيامة**))[٢٢٩] . واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە بمرێت ئەوا جێگەی خۆی نیشان دەدرێت بەیانیان و ئێواران ئەگەر لە ئەهلی بەهەشت بێت جێی خۆی دەبینێت و پێ دەوترێت ئەوە جێگەکەتە، وە ئەگەر دۆزەخی بێت بەهەمان شێوە پێی دەگوترێت ئەوە جێگەکەتە هەتا ئەوکاتەی خوای گەورە تبارك وتعالى زیندوت دەکاتەوە وە دەتنێرێتەوە ناوی).

**(( ڕوون کردنەوەکە تەواو بوو ))**

---

(٢٢٣) في رواية: أبى داود ((السنن)) (٤٧٥١) .

(٢٢٤) في رواية: أحمد ((المسند)) (١١٠٠٠) .

(٢٢٥) أخرجه: ابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٣) وقال محققه : إسناده حسن .

(٢٢٦) في رواية : ابو داود في ((السنن)) (٤٧٥١) ،الاجري ((الشريعة)) (٩١٢) وقال محققه: صحيح.

(٢٢٧) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (٣/٣) رقم (١١٠٠٠) وقال محققه الشيخ الأرناؤط إسناده حسن .

(٢٢٨) أخرجه: البخاري في ((الصحيح)) (١٣٧٤)، ومسلم في ((الصحيح)) (٧١٤٦) .

(٢٢٩) أخرجه : مالك في ((الموطا)) (١/٢٣٩) ، ومسلم في ((صحيح)) (٢٨٦٦) ،والنسائي في ((السنن)) (٤/١٠٧) .

دەگەڕێینەوەی بۆ فەرموودەکەی (براء ) لە ڕیوایەتێکی تردا بە بڕوادارەکە دەوترێ ((هذا مقعدك وما اعد الله لك فيها)) واتە : ئا ئەوە جێگەکەی تۆیەو ئەوانەی خوا بۆی ئامادەکردوویت تیایدا.((فينظر الى زهرتها وما فيها))[٢٣٠] واتە: تەماشای جوانی و ڕازاوەی ئەو جێگەیە و ئەوەی تیایدایە دەکات ((فيريدان ينهض اليه))[٢٣١].واتە: لە خۆشی ئەو جێگەی کە نیشانی دراوە دەیەوێت هەستێت و بۆلای بڕوات .((فيزداد غبطة وسرورا))[٢٣٢] واتە: زیاترخۆشحاڵ و کامەران دەبێت بەتەماشاکردنی ئەو جێگەیەی خۆی کە خوای گەورە بۆی ئامادە کردووە لە ڕیوایەتێکدا. (کاتێك کە ئەو جێگەیەی خۆی دەیبینێت لە بەهەشت دا دەڵێت : ((ربي عجل قيام الساعة كي أرجع إلى أهلي)) . واتە: ( خوای گەورە قیامەت زوو بهێنەرە پێش تاکو بگەڕێمەوە ناو خێزان و ماڵی خۆم) ئەو موسڵمانە دەبینێت کە ئەو گۆڕەی چەندە فراوان کراوە وە بۆی کراوە بە باخچەیەك لە باخچەکانی بەهەشت)[٢٣٣]. وە لە ڕوایەتێکدا (( دعوني حتى أذهب فأُبشِرَ أهلي)) دەفەرموێت : (لێم گەڕێن تا بگەڕێمەوە لای کەس و خێزانم تا مژدەیان بدەمێ بەڵام پێی دەوترێت بێ دەنگ و هێواش و ئارام بە)[٢٣٤]. لە ڕیوایەتێکی تردا پێ ی دەوترێت : ((على اليقين كنت و عليه مت وعليه تُبعثُ إن شاء الله)) واتە : (تۆ لە سەر بیرو باوەڕی چەسپاو بویت دوور لە گومان بووی لە ژیانی خۆت دا ، لە سەر ئەوەش مردیت وە هەر لە سەر ئەو بیرو باوەڕەی خۆت زیندو دەکرێیتەوە إنشاء الله)[٢٣٥]. وە لە ڕوایەتێکدا (پاشان پێ ی دەوترێت بە ئارام بەو بنوو ، ئینجا دەخەوێت وەکو خەوی یەکەم شەوی زاوایەك [کە یەکەم جار بخەوێت لە ماڵی خۆیدا چەندە خەوێکی خۆش و بە ئارامە و حەوانەوەیە. واتە: چاکترین هەڵساندن هەڵی دەسێنێت لە خەو ] تا ئەو کاتە خوای گەورە

---

(٢٣٠) أخرجه : ابن ماجة في((السنن)) (٤٢٦٨) .

(٢٣١) في رواية : أحمد في((المسند)) (١١٠٠٠) .

(٢٣٢) أخرجه: ابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٣) . (١٧٨) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (٣٣١/٣)،وحسنه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٣٤٤) . (١٧٩) في رواية : أبو داود في ((السنن)) (٤٧٥١) .

(٢٣٣) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (٣٣١/٣)،وحسنه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (١٣٤٤) .

(٢٣٤) في رواية : أبو داود في ((السنن)) (٤٧٥١) .

(٢٣٥) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (١٤٠/٦) ، وابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٦٨)، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٤٣) .

زیندووی ده‌كاته‌وه له‌و جێگه‌یه‌وه )[٢٣٦]، [كه‌واته هه‌ر كه‌س له كوێدا بنێژرێت هه‌ر له وێدا زیندوو ده‌كرێته‌وه‌و به‌ره‌و مه‌حشه‌ر ده‌برێت (والله أعلم)]. له ڕیوایه‌تێكی تردا ده‌فه‌رموێت: ((ويعاد الجسد لما بدأ منه فتجعل نسمته في النسم الطيب ،. وهي طير أخضر يعلق في شجر الجنة))[٢٣٧] واته : لاشه‌كه‌ی ده‌گه‌ڕێنرێته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی یه‌كه‌مین جار لیّ ی درووست كراوه كه خۆڵه ، وه ڕۆحه‌كه‌ی ده‌كرێته ناو ڕۆحی پاك ئه‌ویش باڵنده‌یه‌كی سه‌وزه كه چلاوچڵ ده‌كات به‌سه‌ر دره‌خته‌كانی به‌هه‌شته‌وه .كه‌واته لاشه‌ی هه‌موو كه‌سێك ده‌ڕزێت و ده‌بێت به‌خۆڵ جگه له لاشه‌ی نێراوانی خوا(عليهم الصلاة والسلام ) وه‌ك پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌فه‌رموێت: (( إنَّ الله حرّم على الأرض أن تأكل أجساد الأنبياء ))[٢٣٨] . واته: خوای گه‌وره حه‌رامی كردوه له‌سه‌ر زه‌وی كه جه‌سته‌و لاشه‌ی پێغه‌مبه‌ران بخوات. (واته: ئه‌وان لاشه‌كانیان وه‌ك خۆی ده‌مێنێته‌وه له گۆڕدا)، وه هه‌روه‌ها لاشه‌ی هه‌ندێك له شه‌هیدانیش ناڕزێت ، له‌وانه شه‌هیده به‌ڕێزه‌كانی ئوحود: جابر(رضي الله عنه) باسی شه‌هیدبوونی (عبدالله )ی باوكی ده‌كات له جه‌نگی ئوحودا ، و هه‌ڵدانه‌وه‌ی گۆڕكه‌ی له دوای (٤٦) ساڵ ده‌فه‌رموێت :

" رأيتُ أبي في حفرته حين حُضر [ بعد ست وأربعين سنة] كأنه نائم وماتغير من حاله قليلٌ ولا كثير"[٢٣٩] . واته: باوكم بینی له گۆڕكه‌یدا دوای چل وشه‌ش ساڵ له ناشتنی وه‌ك خه‌وتوو وابو هیچ شوێنێكی لاشه‌ی تێك نه‌چووبوو.

ئیمامی (مجاهد) (رحمه الله ) ده‌فه‌رموێت :" المؤذنون أطول الناس أعناقا ولايدودون في قبورهم " [٢٤٠] واته: بانگ بێژه‌كان گه‌ردن به‌رزترین كه‌سانن له (قیامه‌تدا) وه له گۆڕه‌كانیاندا كرم تێیاننادات و لاشه‌یان ناڕزێت.

---

(٢٣٦) أخرجه : الترمذي في ((السنن)) (١٠٧١) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٧) ، وابن أبى عاصم في ((السنة)) (٨٦٤) ، وقال محققه الشيخ الألباني : إسناده حسن ، واللفظ له .

(٢٣٧) أخرجه : ابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٣) ، والطبراني في ((الأوسط)) (٢٦٥١) .

(٢٣٨) أخرجه: أحمد (٨/٤) ،وأبوداود ( ١٠٤٧) ، وابن ماجة (١٠٨٥) ، والنسائي (٩١/٣) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح أبي داود)) (٩٦٢) ، و(( صحيح ابن ماجة)) (٨٨٩) ، و(المشكاة)) (١٣٦١) .

(٢٣٩) أخرجه: ابن سعد (( الطبقات)) (٥٦٢/٣) ،وملك (٤٧٠/٢) وسنده صحيح كما قال الأرناؤوط في تخريجه لـ(( زاد المعاد)) (٢١٦/٣).

**ڕوون کردنه‌وه یه‌ك (( گۆڕه وشار ))**

هه‌موو که‌سێك گۆڕه‌وشار ده‌درێت لـه گۆڕه‌که‌یـدا . ئه‌گـه‌ر پله‌شـی یـه‌کجار بـه‌رز بێت. وه‌کوپێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ده‌فه‌رموێت: ((**إن للقبر ضغطة لو نجا منها أحد لنجى منهـا سـعد بـن معاذ**)) [٢٤١] واته: گۆڕ گووشینێکی هه‌یه گه‌ر هه‌بوایه له‌و گوشینه ڕزگاری ببوایه ئه‌وا سـه‌عدی کـوڕی موعـاز (رضي الله عنه) ده‌بووکـه ڕزگـاری ببێـت لـه گۆڕه‌وشـار، لـه ئـه‌بوو ئه‌یوبـه‌وه (رضي الله عنه) ده‌فه‌رموێت: ( پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) منداڵێکی خسته ناو گۆڕه‌وه‌و فه‌رمووی: ((**لو أفلت أحـد مـن ضمّة القبر لأفلت هذا الصبـي**)) )[٢٤٢] . واته: گه‌ر که‌سێك هه‌بوایه ڕزگاری ببێت له‌گۆڕه‌وشار ئه‌وائه‌م منداڵه ڕزگاری ده‌بوو . دیاره ئازاری گۆڕه‌وشار به گوێره‌ی پله‌ی ئه‌و موسوڵمانه‌یه گه‌ر به‌نده‌یه‌کی چاك بێت ئازاره‌که‌ی بۆ که‌م ده‌کرێته‌وه به‌ڵام گه‌ر تاوانباربێت ئه‌وا ئازاره‌که‌ی له‌سه‌ر قورس ده‌کرێت . پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) دوای ئه‌وه‌ی سه‌عدی خسته گۆڕه‌وه فه‌رمووی :

((**هذا الذي تحرك له العرش وفتحت له ابواب السماء وشهده سبعون ألفـا مـن الملائكـة**))

واته : ئائه‌مه ئه‌و که‌سه‌یه که خوای گه‌وره عه‌رشی بۆ هێنایه له‌رزه (واته : بۆ سـه‌عدی کـوڕی موعـاز (رضي الله عنه)) وه ده‌رگاکانی ئاسمانی بۆ کرایه سه‌ر پشت ، وه حـه‌فتا هـه‌زار فریـشته له‌گـه‌ڵ جه‌نازه‌که‌یدا ئاماده بوو: ((**لقد ضمّ ضمّة ثم فُـرّج عنـه**))[٢٤٣] واتـه : گۆڕه‌وشـار دراو پـاش تۆزێك یه‌کسه‌ر ڕزگاری بوو ، وه ئه‌مـه‌ش به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی ماوه‌یه‌کی زۆر که‌م بووه ئه‌وه‌ی (سه‌عد) . دیاره زانایان ده‌ڵێن وه‌کو چۆن دایکێکـی خۆشه‌ویـست جگـه‌ر گۆشـه‌که‌ی ئه‌گرێتـه

---

(٢٤٠) أخرجه: عبدالرزاق (( المصنف)) (١٨٦٠) ، وقال قتادة : " بلغني أن الارض لا تسلط على الجسد الذي لم يعمل خطيئةٍ" أورده : المروزي في ((الجنائز)) (٧٥).

(٢٤١) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (٦/٥٥) وفي ((كتـاب فـضائل الـصحابة)) (١٥٠١) ، والطحـاوي في ((مـشكل الآثـار)) (٢٧٤) ، و البيهقي في : ((إثبات عذاب القبر)) (١١٩) ، وابن حبان في : ((الصحيح)) (٣١١٢) وقـال محققـه : إسـناده صحيح على شرطهما ، وقال الهيثمي في : ((المجمع)) (٣/٤٦) رواه أحمد وكلا الطريقين رجالهمـا رجـال الـصحيح ، و صححه الشيخ الألباني في : ((صحيح الجامع)) (٢١٨٠) ، و ((السلسلة الصحيحة)) (١٦٩٥) .

(٢٤٢) أخرجه: الطبراني (٣٨٥٨) ، وقال الحافظ في (( المطالب العالية)) (٤٥٢٧):اسناده صـحيح، وصـحح اسـناده أيـضاً السيوطي في ((شرح الصدور)) (ص:١٠٨).

(٢٤٣) أخرجه : وأحمد في : ((فضائل الصحابة)) (١٤٩٧) وقال محققه : اسناده صحيح ، والطبراني ((الكـبير)) (١٨/٧) ، النسائي في ((السنن)) (٤/١٠٠) ، ، وصححه الشيخ الألباني في : ((صحيح النسائي)) (١٩٤٢) .

باوەش و دەیگوشێت بۆیە موسوڵمانی لە خوا ترس گوشینەکەی ئاوا دەبێت وە ئادەمیزادی کافریش دیارە بە پێچەوانەوەیە .

زانای پایە بەرز (الحكيم الترمذي) دەفەرموێت : (" هۆی گۆڕەوشار ئەوەیە کە هەموو کەسێك گوناهێکی کردوە یان ئارەزووی گوناهێکی کردوە ، بۆیە گۆڕەوشار سزایە بۆ ئەوانە و پاشان بەزەی خوا فریای دەکەوێت" .

زانای پایە بەرز (محمد التميمي )دەفەرموێت : " گوشینی گۆڕ بەهۆی ئەوەوەیە کە زەوی ئادەمیزادی لێ ی دروست کراوە وەکو دایکی وایە ، ماوەیەکی زۆر لێ ی دوور کەوتۆتەوە ، کاتێك دەبرێتەوە بۆ لای وەك دایکێك کەجگەر گۆشەکەی ماوەیەکی زۆر لێ ی دوور کەوتۆتەوە باوەشی پیادەکات و لە ئامیزی دەگرێت ، ئەوانەیان کەچاکە کار بوون بە بەزەیەوە و لەسەرخۆ لە ئامێزیان دەگرێت ، وە ئەوانەیان کە سەر پێچی کار بوون لەبەر تورەبوونی خوا لێیان بە توندی و سەختی لە ئامێزیان دەگرێت بەڵگەش بۆ ئەمە فەرموودەکەی (عائیشە)یە (رضي الله عنها ) کە دەفەرموێت : (( ... **إنَّ ضعطةُ القبر على المؤمن كالأم الشفيقة يشكو إليها إبنها الصداع** ....)) واتە: گوشینی گۆڕ لەسەر بڕوادار وەك دایکی بە بەزەیی وایە کەجگەر گۆشەکەی تووشی سەر ئێشە هاتبێت و سکاڵای سەر ئێشەی لابکات.)[٢٤٤].

**(( ڕوون کردنەوەکە تەواو بوو ))**

دەگەڕێینەوە بۆ فەرموودەکەی (براء) پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : ((**فيأتي بە أرواح المؤمنين – في رواية– [ إنَّ المؤمن يصعدُ بروحه الي السماء فتأتيه أرواح المؤمنين فيستخبرونه عن معارفهم من أهل الارض]** ))[٢٤٥] واتە: ڕۆحەکەی بەرز دەکرێتەوە بۆ لای ڕۆحی پیاو چاکان و خاوەن باوەڕان ، لە ڕیوایەتێکی تردا ((ئادەمیزادی خاوەن باوەڕ ڕۆحەکەی بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان و ڕۆحی خاوەن باوەڕانی چواردەوری لێ ی کۆدەبنەوە هەواڵی ناسیاوانی خۆیانی لێ دەپرسن لە خەڵکی زەوی)).

---

(٢٤٤) انظر : (( لوامع الأنوار البهية)) (١٦/٢) والحديث آورده ابن النجار و البيهقي وابن منده و الديلمي .

(٢٤٥) أخرجه: عبدالله ابن أحمد في ((السنة)) (١٣٧٥) ، وصحح إسناده السيوطى في ((بشرى الكئيب)) رقم (٦٨) ، وقال الشيخ الألباني في:((السلسلة الصحيحة)) (١٦٢٨) ، وفي ((آيات البينات)) (ص: ١٠٥) : إسناده حسن .

((**فلهم اشد فرحا من (أحدكم بغائبه يقدم عليه)**)) واتــه : ((ئـه‌وان زۆر زۆر خۆشـحاڵن بـه هاتنی ئه‌و ڕۆحی موسوڵمانه (وه‌کو چۆن یه‌کێکی خۆشه‌ویـستان لـه ده‌ره‌وه دێتـه‌وه ئێـوه زۆر په‌رۆشن وه خۆشحاڵن به بینینی)) و پرسیاری لێ ده‌که‌ن ((پێی ده‌ڵێن)) فلانه که‌س چـی کـرد ((فلان ئافره‌ت چی کرد))[٢٤٦] . پاشان له ڕوایه‌تێکدا : [**فيقولون دعوه : حتى يستريح**]... واته : (هه‌ندێکیان به هه‌ندێکیان ده‌ڵێن وازی لێ بێنن با که‌مێك پشوو بدات چـونکه تـازه لـه خه‌می دنیا ڕزگاری بووه و ناڕه‌حه‌تیه‌کی یه‌کجار زۆری به‌سه‌ره‌وه بووه با تۆزێ بێته‌وه سه‌ر خۆی پاشان ئه‌ویش وه‌ڵامیان ده‌داته‌وه و ده‌ڵێت : (... **قد مات** ..) ئه‌وه مردووه ئه‌ی نه‌هات بـۆ لای ئێوه ئه‌وانیش ده‌ڵێن : ((**ذهب به الى أمه الهاوية**)) [٢٤٧]. واته: براوه بۆ جێگه‌ی خۆی لای ئه‌هلی دۆزه‌خ وه له ڕوایه‌تێکدا : ده‌فه‌رموێت : [ (( **فإذا قال : تركتُ فلانا في الدنيا ، أعجبهم ذلك وإذا قال : إن فلاناً قد مات ، قالوا ماجيء به إلينا وقد ذُهِبَ بروحـه إلى أرواح الكفـار** )) واته: ئه‌گه‌ر له وه‌ڵامدا بڵێت فلانه که‌سم جـێ هێـشت ئێـستاش هـه‌ر لـه دنیـادا مـاوه زۆر به‌لایانه‌وه سه‌یر ده‌بێت و [ واته: خۆشحاڵن به‌وه‌ی که له دنیـادا مـاوه کـاری چـاکه ده‌کـات و پێیان خۆشه ئه‌وانیش وه‌کو ئه‌و بونایه ] وه ئه‌گه‌ر بڵێت فلان که‌س که ئێوه پرسیاری لێ ده‌که‌ن مردووه، ده‌ڵێن نه‌هاتووه بۆ لای ئێمه و ڕۆحی براوه بۆ لای ڕۆحی کافره‌کان ][٢٤٨] .

## ڕوون کردنه‌وه‌یه‌ك (( جێگه‌ی ڕۆحه‌کان ))

صه‌حابی به‌ڕێز عه‌بدوڵای کوڕی عه‌مری کوڕی عاص (رضي الله عنه)ده‌فه‌رموێت: (( **أرواح المؤمنين في جوف طير كالزرازير يتعارفون ويرزقون من ثمر الجنة**))[٢٤٩] . واته : ڕۆحی بڕواداران له ناو

---

(٢٤٦) أخرجه : ابن حبان في ((الصحيح)) (٣٠١٣) وقال محققه: إسناده صحيح على شرطها .

(٢٤٧) أخرجه: النسائي في ((السنن)) (٨/٤) ، والحاكم في ((المستدرك)) (٣٥٢/١) و صححه ووافقه الذهبي ، و ابن حبان في ((الصحيح)) (٣٠١٤) وقال محققه : إسناده صحيح ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (١٧٢٩)، وفي ((صحيح الجامع)) (٤٩٠) ، و في ((السلسلة الصحيحة)) (١٣٠٩) .

(٢٤٨) أخرجه : البزار في ((المسند)) (٨٧٤) ، وحسن إسناده الشيخ الألباني في ((الأيات البيانات)) (ص :١٠٥) .

(٢٤٩) أخرجه : ابن أبي شيبة في ((المصنف)) (١٠٣/٣) ، وابن مبارك في ((الزهد)) (ص :٤٤٩) ، و أبو نعيم في ((الحلية)) (٢٨٩/١) ، والبيهقي في : ((البعث)) (٢٠٧) ، وقال الشيخ الألباني في ((الأيات البينات)) (ص :١٠٢) : سنده صحيح عن عبدالله بن عمرو موقوفا .

چەند باڵندەیەکدایە کە لە چۆلەکە زۆر بچوکترە خۆیان بە یەکتر دەناسێنن وە ڕۆزیان دەدرێتێ لە ڕۆژی بەهەشت . لێرەدا دەردەکەوێت کە ڕۆحی موسوڵمانان هەندێکیان لە ناو ئەو باڵندە بچوکانەدان وە هەندێکیان دەچنە ناو باڵندەیەکی ڕەنگ سەوزەوە وە هەندێکیان خۆیان وەك باڵندەی سەوزوان ، بەڵام هەندێ لەو ڕۆحە پاکە بەرێزانە کە ڕۆحی شەهیدانن لە پێش دەرگای بەهەشت لە قوبەیەکی سەوزدان وەکو پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت :

((الشهداء على بارق نهر بباب الجنة)) واتە : شەهیدەکان لە قەراخی ڕوبارێکن لە بەردەمی دەرگای بەهەشتەوە لە قوبەیەکی سەوزدا ((يخرج إليهم رزقهم من الجنة بكرة وعشيا))[٢٥٠].

واتە: ڕۆزیان بۆ دێت لە بەهەشتەوە بەیانی و ئێوارە. وە ڕۆحی هەندێك لە بڕواداران لە ناو چەند باڵندەیەکی سەوزدان وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:((أرواح المؤمنين في أجواف طيرخُضر يَعْلُقُ في أشجار الجنة حتى يردها الله إلى أجسادها يوم القيامة))[٢٥١]. واتە: ڕۆحی بڕواداران لە ناو چەند باڵندەیەکی سەوزدان لەدرەخت ومیوەکانی بەهەشت دەخۆن تا خوای گەورە دەیانگێڕێتەوە ناو لاشەکانیان لە ڕۆژی قیامەتدا. بەڵام شەهیدەکانی ئوحد کە سەروەری شەهیدەکانی موسوڵمانن لە بەهەشتدا لەناو باڵندەیەکی سەوزدان وەکو پێغەمبەری ئازیز دەفەرموێت (ﷺ) : (کاتێك براکانتان شەهید کران لە جەنگی ئوحوددا خوای گەورە ڕۆحەکانیانی خستە ناو باڵندەیەکی سەوزەوە [ واتە: وەکو تۆ چۆن دەچیتە ناو (فڕۆکەیەك) ] لەڕیوایەتێکدا : دەفەرموێت[ أرواحهم كطيرٍ خضر تسرح في الجنة أيها شاءت ... ][٢٥٢]

واتە: ڕۆحەکانیان وەك باڵندەی سەوز وایە بۆ هەر جێگەیەك بیەوێت لە بەهەشتدا و دەڕوات وە هاتوو چۆ دەکات بە سەر درەخت و ڕۆخی ڕووبارەکانی بەهەشتدا لە بەرو بوومەکەی دەخوات کە ئێوارەیان بەسەردا دێت ئەو باڵندانە دەگەڕێنەوە بۆ هیلانەکانیان لە ژێر چرا ئاڵتونیەکانی

---

(٢٥٠) أخرجه :أحمد في ((المسند)) (٢٦٦/١)، والطبراني في ((المعجم الكبير)) (١٠٨٢٥) ،والحاكم في ((المستدرك)) (٧٤/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي ، و ابن حبان في ((الصحيح)) (٤٦٥٨) وقال محققه:إسناده قوى، وحسنه الألباني في ((صحيح الجامع)) (٣٧٤٢)، وقال محقق (زاد المعاد) (٩٢/٣): إسناده صحيح.

(٢٥١) أخرجه: الطبراني ((الكبير)) (ج:١٩) برقم (١٢٢) ،وابن ماجة (١٤٤٩) ،وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٩١٢) ، و((صحيح ابن ماجة)) (١١٨٧).

(٢٥٢) أخرجه : ابن ماجة (٢٨٠١) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح ابن ماجة)) (٢٢٥٩).

سێبەری عەرشی خوادا. دەفەرموێت : کاتێك هەستیان کرد چەندە خواردن و خواردنەوەکەیان خۆشە و شوێنی حەوانەوەکەیان لە چرا ئاڵتوونی یەکانی ژێر سێبەری عەرشە، [ کەواتە: بە و شێوەیە ڕۆحەکان نیعمەتی خواردن وخواردنەوەیان هەیە و خوای گەورە ڕۆزی پێ بە خشیون ] ، پاشان دەفەرموویان : دەبێ کێ بێت هەواڵ بگەیەنێتە براکانمان کە ئێمە زیندووین لە بەهەشتدا ڕۆزیمان پێدەدرێت بۆ ئەوەی دوور نەکەونەوە لە [جیهاد] و واز لە تێکۆشان دژ بە بێ باوەڕان نەهێنن لە کاتی جەنگدا ، پاشان خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ (آل عمران: ١٦٩) )[٢٥٣]. واتە : وامەزانن ئەو شەهیدانەی لەڕێی خودادا گیانیان لە دەست داوە مردوون بەڵکو زیندوون لای خوای خۆیان ڕزقیان دەدرێتی .کەواتە ڕۆحەکان هەندێکیان لای گۆڕەکانیانن و هەندێکیان لە ئاسمانن و وە هەندێکیان لە شێوەی باڵندەیەکدان وە هەندێکیان لە ڕۆخی ڕووبارەکانی بەهەشتدان وە هەندێکیان لە ناو باڵندەیەکی سەوز دان لە ژێر چرا ئاڵتونی یەکانی ژێر عەرشدان وە هەندێکیان لە ( **أعلى عليين** ) واتە : کۆمەڵی هەرە ژووروودان کە ئەوانیش ڕۆحی پێغەمبەرانن (**عليهم الصلاة والسلام** ) و هەندێکیان بەندکراوون لە ناو گۆڕەکانیاندا وە هەندێکیان بەندکراون لە زەویدا...[٢٥٤] .

**(( ڕوون کردنەوەکە تەواو ))**

# گیان کێشانی کافر

ئێستا دەگەڕێینەوە سەر باسی گیان کێشانی کافر لە درێژەی فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە (براء) دەیگێڕێتەوە دەفەرمووێت : (( **إن العبد الكافر** )) لە ڕیوایەتێکی تردا [(الفاجر) إذا كان في إنقطاع من الدنيا وإقبال من الآخرة ] ـ لە ڕیوایەتێکی تردا ـ [إن الكافر إذا إحتضر ][٢٥٥] ـ [ نزل إليه من السماء ملائكة العذاب ][٢٥٦]ـ لە ڕیوایەتێکی تردا

(٢٥٣) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (٢٦٦/١) ، والطبراني في ((المعجم الكبير)) (١٠٨٢٥) ، والحاكم في ((المستدرك)) (٧٤/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبى ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٤٦٥٨) ، وقال محققه إسناده قوى ، وحسنه الألباني في ((الصحيح الجامع)) (٣٧٤٢) ، وقال محققه (زاد الميعاد) (٩٢/٣) : إسناده صحيح .

(٢٥٤) انظر : ((الروح)) لابن القيم (ص :١١٥).

(٢٥٥) أخرجه : النسائي في ((السنن)) (١٠/٤) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح النسائي)) (١٧٢٩) .

ـ [ملائكة غِلاظٌ شِداد] سود الوجوه معهم المسوح من النار ـ له ڕیوایەتێکی تردا ـ [أرسل إليه بقطعة نجاد أنتن من كل نتن،وأخشن من كل خشن ](٢٥٧) فيجلسون منه مد البصر فيقولون: اخرجي ساخطة مسخوطاً عليك إلى عذاب الله عز وجل ] (٢٥٨) [وسخطه](٢٥٩) ـ له ڕیوایەتێکی تردا [قيل أيتها النفس الخبيثة كانت في الجسد الخبيث ، اخرجي ذميمة وأبشري بحميم وغساق وآخر من شكله أزواج ، فلا يزال يقال لها ذلك حتى تخرج ] ))(٢٦٠) واتە : کاتێك کافر یان خراپە کار نزیکی مردن دەبێتەوە ، فریشتەکانی سزا لە ئاسمانەوە دێنە خوارەوە بۆ لای کە زۆر توندو تیژو بەزەبر و هێزن ، و ڕوخسار ڕەشن کفنێکیان پێیە لە ئاگرەکە زبر ترە لە هەموو زبرییێك وە بۆ گەنترە لە هەموو بۆگەنێك ، پاشان لای دادەنیشن هەتا چاوی بڕ دەکات وە پێی دەڵێن : ئەی ڕۆحی لێ توڕەبوو وەرە دەرەوە بۆ لای سزا وتوڕەیی خوای گەورە. یان پێی دەڵێن : ئەی ڕۆحی پیس کە لەجەستەیەکی پیس دا بوویت وەرە دەرەوە بێزراویت وە مژدەت لێ بێ بەسزای ئاوی لە کوڵ هاتوو و پیسی دۆزەخ ، ئەمانەی پێ دەوترێت تاوەکو دێتە دەرەوە.(٢٦١) بێگومان ئەو ڕۆحەش لەم کاتەدا کە مژدەی ئەو سزایەی پێ دەدرێ پێی ناخۆشە کە بگات بە خوای گەورە .

وە لە ڕوایەتێکدا : ((..... إذا كان عدوُّ الله نزل به الموت وعاين ما عاينَ ، فإنه يحب أن لا تخرج روحه أبدا والله يُبغِضُ لقاءه ...)) (٢٦٢). واتە : (گەر دوژمنی خوا کاتی مردنی هات

---

(٢٥٦) أخرجه : الحاكم في ((المستدرك)) (١/٣٥٢) .

(٢٥٧) أخرجه : الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (٢/٣٢٨) مرفوعا .

(٢٥٨) أخرجه : النسائي في ((السنن)) (٤/١٠)، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (١٧٢٩) .

(٢٥٩) أخرجه : الحاكم في ((المستدرك)) (١/٢٥٣) ، وصححه ووافقه الذهبي ، وصححه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (١٣٠٩).

(٢٦٠) أخرجه : النسائي في ((التفسير)) (٤٦٢) وقال محققه إسناده صحيح ، وابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٦٢) ، وأحمد في ((المسند)) (٢/٣٦٤) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٩٦٨) ، وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٣٤٣٧)

(٢٦١) نفس المصدر .

(٢٦٢) أخرجه: البزار في ((المسند)) (٨٧٤) ، وعبدالله بن أحمد ((السنة)) (١٣٧٥) ، وصححه السيوطى في ((بشرى الكئيب )) رقم (٦٨) ، وحسن إسناده الشيخ الألباني في ((الآيات البينات)) (ص : ١٠٥) وفي رواية ((ان الكافر اذا حضر ﴿فبشر بعذاب لله و سخطه كره لقاء لله وكره لله لقاءه ﴾)) هذا أخرجه : البخارى في ((الصحيح)) (٦٥٠٢ ـ

و ئەو فریشتانەی بینی حەز دەکات هەرگیز ڕۆحی دەرنەچێت ، وەخوای گەورەش پێی ناخۆشە ئەو بەندە یەی پێ ی بگات) .وە بەردەوام فریشتەکان ئەو هەڕەشانەی لێ دووبارە دەکەنەوە...((ثم يجئ ملك الموت)) (ﷺ) پاشان فریشتەی گیان کێشان (سەلامی خوای لێ بێت ) دێتە لای سەریەوە و دادەنیشێت و پێی دەڵێت : ئەی نەفسی پیس وەرە دەر بۆ لای ڕق و تورەیی خواو . ڕۆحەکەش بەلاشەکەیدا بڵاودەبێتەوەفریشتەی گیان کێشانیش ڕای دەکێشێت و دەیهێنێتەدەر وەکو چۆن شیشێکی گۆشت برژاندنی قولاپدار بکرێت بەناو خوریەکی تەڕی ـ ئاڵۆسکاودا هەمو خوریەکە لەگەڵ خۆیدا بەیەکجار دەهێنێتە دەرەوە کە دەردێت هەمووشی دەئاڵۆسکێ بەیەکدا ... بەهەمان شێوە ئەو گیان دەرچوونە هەموو ئەو دەمارو دەزولانەی ناو لەشی ئەو کافرەی پێ پارچە پارچە دەبێ لەو کاتەدا هەموو فریشتەکانی نێوان ئاسمان و زەوی وە هەموو فریشتەکانی ئاسمان نەفرینی لێ دەکەن و هەموو دەرگاکانی ئاسمانی لەسەر دادەخرێت، وە هەموو فریشتەکانی دەرگاوان داوا دەکەن لە خوا کە ئەو ڕۆحە پیسە بەلایاندا بەرز نەبێتەوە و تێنەپەڕێت لەوێوە بەرەو سەرەوە ئنجا ڕۆحەکە دەهێنرێتە دەرەوە ...)) . (وە ڕۆحی کافر لە لاشەویلگەیەوە دەهێنرێتە دەرە وەك ڕۆح کێشانی کەر) [٢٦٣] وە لە چاو تروکانێکدا لە دەستی فریشتەی گیان کێشانی وەردەگرن و دەیکەنە ناو ئەو کفنە زبرە بۆن ناخۆشە بۆگەنە دۆزەخیەوە کە ئامادەکراوەبۆ ڕۆحە گڵاوەکەی لە کاتی دەرکێشانی ئەو ڕۆحە پیسە بۆن ناخۆشەدا ، ناخۆشترین بۆن لەو شوێنەدا لەسەر زەویدا بڵاودەبێتەوە بە هۆی ئەو ڕۆحەوە پاشان بەو ڕۆحە پیسەوە کە تێدەپەڕن بەلای هەر کۆمەڵێکدا لە فریشتەکان ئەوان دەڵێن: ئەم ڕۆحە پیسە کێیە؟ پێیان دەڵێن : ئەمە فلانی کوڕی فلانە بەناشرین ترین ناو کەلە دنیادا ناوی براوەو پێی ناسراوە هەتا دەگەیەنرێتە ئاسمانی دنیا ، داوای کردنەوەی دەرگای ئاسمان دەکەن بۆ ئەو ڕۆحە کە بچێتە سەرەوە ، دەرگاوانی ئاسمان پێی دەڵێ : ئەمە کێیە؟

---

٦٥٠٧) ، ومسلم في ((الصحيح)) (٢٦٨٢ـ ٢٦٨٤) ، والنسائي في ((السنن)) (١٠/٤) وابن حبان في ((الصحيح)) (٣٠٠٩ ـ ٣٠١٠) .

(٢٦٣) في رواية : عن ابن مسعود مرفوعا ((ونفس الكافر تخرج من شدقه كما تخرج نفس الحمار)) أخرجه :الطبراني في ((المعجم الكبير)) (١٠٤١٧) ، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (٣٢٣/٢) رواه الطبراني وإسناده حسن ، والمسوح: الثوب الخشن : (القاموس المحيط) (٣٦١/١).

دەڵێن : ئەمە فلانی کوڕی فلانە ئەویش دەڵێ : ئەی ڕۆحی پیس کە لەلاشەی پیس دا بویت بێزراوی پێشوازیت لێ نەبێت بڕۆ هەرگیز دەرگاکانی ئاسمانت بۆ ناکرێتەوە ...)[٢٦٤] .

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُجۡرِمِينَ ٤٠ ﴾ (الأعراف :٤٠) . واتە : هەرگیز دەرگای ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوەو ناچنە بەهەشت هەتا ووشتر نەچێت بە کونی دەرزیدا کە ئەوەش مەحاڵە واتە هەرگیز ناچنە بەهەشت ، ئا بەو شێوەیە تاوانکار سزا دەدرێت هێشتا ڕۆحەکەی بەرز نەبووەتەوە بۆ سەرەوە ئەمەی پێ ووتراوە ، وە خوای گەورە دەفەرموێت : ناوی بەندەکەم بنووسن لە ((سجين))دا لە ژێر حەوتەم زەوی هەرە خوار ...)[٢٦٥] .

پاشان پێی دەوترێت : ئەو بەندەیەم بگێڕنەوە بۆ زەوی چونکە من بەڵێنم داوە کە لە زەوی دروستم کردون و دەیانگێڕمەوە بۆ ناو زەوی وە هەر لەناو زەویەوە دیسان زیندویان دەکەمەوە، وە ڕۆحەکەی فڕێ دەدرێت لە ئاسمانەوە چۆن فڕێ دانێك هەتا دەگەڕێتەوە و دەکەوێتە ناو لاشەکەی خۆی ، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێت: ﴿ حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيۡرَ مُشۡرِكِينَ بِهِۦۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخۡطَفُهُ ٱلطَّيۡرُ أَوۡ تَهۡوِي بِهِ ٱلرِّيحُ فِي مَكَانٖ سَحِيقٖ ٣١ ﴾ (الحج: ٣١) .واتە : هەرکەسێ هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات ، وەکو کەسێك وایە لە ئاسمانەوە بکەوێتە خوارەوە و باڵندە شاڵاوی بۆ ببات یان بایەکی بەهێز بیکاتە ناو قوڵترین شوێن لە خوارووی زەویدا، ڕۆحەکەی دێتەوە ناو لاشەکەی وەکو پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((اذا وضعت الجنازة وحملها الرجال على أعناقهم ... ، إن كانت غير صالحة قالت: ياويلها [ إلى ] أين يذهبون بها يسمع صوتها كل شيء الا الانسان ..)). واتە: کاتێ جەنازەی پیسی ئەو کافرە دەکرێتە سەر شانی ئەو کەسانەی کە هەڵیان گرتووە بەرەو گۆڕستان هاوار دەکات لەسەر دارەمەیتەکە و دەڵێت: ئەی هاوار بۆ کوێی دەبەن ،هەموو شتێك گوێ ی لە

(٢٦٤) أخرجه: النسائي في ((التفسير)) (٤٦٢) ، وابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٦٢) ، وأحمد في ((المسند)) (٢/٣٦٤)، والطبرى في ((التفسير)) (٨/١٢٩) .

(٢٦٥) أخرجه: البيهقى في ((شعب الايمان)) (٣٩٥) وقال حديث صحيح الاسناد .

دەنگی دەبێت تەنها ئادەمیزاد نەبێت ..((ولو سمعها الانسان لصعق)) واتە: گەر ئادەمیزاد گوێی لێبێت لە ترسا دەمرێت . پاشان دەکرێتە ناو گۆڕەکەوە وخۆڵەکەی دەدرێت بەسەردا وگوێی لە دەنگی نەعل وپێڵاوی هاوڕێکانیەتی کە بەجێ ی دەهێڵن و لێ دوور دەکەونەوە)[٢٦٦]. ئینجا دەفەرموێت : ((..... اتاه ملكان أسودان ازرقان [شديدا الأنتهار ]))[٢٦٧]. واتە : دوو فریشتەی ڕووخسار ڕەشی چاو شینی یەکجار تووڕەو بەزەبر دێنە سەری (یەکێکیان ناوی مُنکرەئەوی تریان ناوی نکیرە)). لە ڕیوایەتێکدا دەفەرموێت:((في يده مطراق))[٢٦٨]، واتە چەکوشی بەدەستەوەیە ، پاشان هەردوو لێ ی تورە دەبن و تێ ی دەخوڕن ...((وان الكافر اذا اوتى من قبل رأسه لم يوجد شيء ، ثم اتى عن يمينه فلا يوجد شيء ثم أتى من قبل رجليه فلا يوجد شيء فيقال له : أجلس فيجلس خائفاً مرعوباً ))[٢٦٩] واتە : لای سەریەوە بۆی دێن هیچ شتێك نی یە ڕێگریان بکات ،پاشان لای ڕاستیەوە بۆی دێن ، دیسان هیچ شتێك نییە ڕێگریان بکات ، پاشان لای هەردوو قاچیەوە بۆی دێن ، و دیسان هیچ شتێك نییە ڕێگریان بکات ئەوان دێن و پاشان پێی دەوترێت : دانیشە . ئەویش دادەنیشێت بەترس و توقینێکی گەورەوە .(چونکە کافر هیچ نوێژو ڕۆژوو و چاکەی نی یە تا چواردەوری بگرێت و بیپارێزێت ) . ((ليس بينه و بينه شيء فأجلسه))[٢٧٠] وە هیچ شتێك لە نێوانیاندا نابێت دای دەنیشێنێت[٢٧١] و پێی دەڵێن خوای تۆ کێیە ؟ دەڵێ ها . ها نازانم، وە پێی دەڵێن : ئاین و بەرنامەت چی بوو لە ژیاندا : دەڵێ ها ها نازانم ، وە پێی دەڵێن : ئەو پیاوەی لە ناوتان دا بوو چی بوو ؟ وە چی

---

(٢٦٦) أخرجه: البخاري في ((الصحيح)) : (١٣١٤) .

(٢٦٧) أخرجه: أحمد (٣٥٢/٦) ، الترمذي في ((السنن)) (١٠٧١) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٧) وقال محققه إسناده قوى ، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) ( ٨٥٦) ،وفي ((صحيح الجامع)) (٧٢٤) ، و ((المشكاة)) (١٣٠) و ((السلسلة الصحيحة)) (١٣٩١) .

(٢٦٨) أخرجه: أحمد في ((المسند)) (١١٠٠٠) ، وابن ابى عاصم ((السنة)) (٨٦٥) .

(٢٦٩) أخرجه: ابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٣) .

(٢٧٠) أخرجه: أحمد في ((المسند)) : (٣٥٢/٦) .

(٢٧١) واتە:دایدەنیشێنێت ،وە ئەو بە هیچ شێوەیەك لە خەیاڵدا نەبووە ڕۆژێك لە ڕۆژان بڕوا بۆ ئاسمان و فریشتە ببینێت و بچێتە ناو گۆڕو پرسیاری لێ بکرێت و زیندوبونەوە هەبێت ، ئەمانە هەموو مەحاڵ بووە لە مێشکیدا بەڵام ئێستا کە کەوتوەتە ئەو ڕاستی یەوە زۆر تۆقیوە و سەرسامە.

دەڵێ ی لە بارەیەوە دەڵێت: ها ها نازانم )[٢٧٢] ، و دەفەرمویێت ((إن كان منافقا، **قال :[ ها ها] لا أدرى كنتُ (أسمع الناس يقولون شيئاً فكنت أقول)كما قال الناس [لا أدري]...)**[٢٧٣] واتە: گەر ئەو کەسە دووڕوو بێت دەڵێت: هاها نازانم ، گوێم لێ بوو خەڵکان شتێکیان دەووت : منیش ووتەکەی ئەوانم دەوتەوە، نازانم. (بێ گومان گەر کافر بێت نایناسێت بەڵام گەر دوو ڕوو بێت شتێکی لەبارەوە دەزانێت بۆیە: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((**يبعث كل عبد في القبر على مات عليه المؤمن على ايمانه والمنافق على نفاقه**))[٢٧٤] واتە:[هەموو کەسێك لەسەر ئەو بیرو باوەڕی دنیای کە لەسەری مردووە زیندوو دەکرێتەوە لە گۆڕدا بڕوادار لەسەر بڕواداری خۆی و دووڕوو لەسەر دووڕوی خۆی ] بێگومان دووڕوو لە ژیانیدا هەر دووڕوو بووە لە گۆڕیشدا و لە قیامەتیشدا هەر دووڕووە لەسەر پردی سیراتیش هەر دووڕووە هەتا دەکەوێتە خوارەوە و خوای گەورە چارەنووسی بەقولایی هەرە خوارووی جەهەنم دەگەێنێت) پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : (کاتێ کە پرسیار دەکرێت لە دوو ڕوو (دەڵێ : ها ها نازانم گوێم لە خەڵکان بوو شتێکیان دەوت محمد پێغەمبەرە(ﷺ) منیش هەر وام دەوت)[٢٧٥] . وەك چۆن خەڵکان دەیان ووت دووبارەم دەکردەوە ،دەفەرموێت: ئەوانیش پێی دەڵێن: ((**لا ادريت ولا تليت ولا اهتديت**))[٢٧٦].واتە: نەشت زانیوە و نەشت خوێندوە و ڕێنمویش نەکراویت ، ((**ولاصدقت**))[٢٧٧]. و بەڕاستیشت نەزانیوە ، تۆ لەسەر ئەو گومان و دووڕوویی یەی خۆت ژیانت بردە سەر ، وە هەر لەسەر ئەوەش مردیت ، وە هەر لەسەر ئەوەش زیندو دەکرێیتەوە

---

(٢٧٢) ابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٣).

(٢٧٣) أخرجه : الترمذي (١٠٨٣) ، وحسنه الشيخ الألباني في (١٣٩١) ، و((صحيح الترمذي)) (٨٥٦)، ابن حبان في ((الصحيح)) : (٣١١٣) .

(٢٧٤) أخرجه أحمد في ((المسند)) : (٣٤٦/٣) رقم : (١١٠٠٠) وقال محققه اسناده حسن ،وقال ابن كثير في ((تفسير القرآن العظيم)) (٣٧٠/٣) اسناده صحيح على شرط مسلم .

(٢٧٥) أخرجه: الترمذى في ((السنن)) (١٠٨٣) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٧) ، وابن ابى عاصم في ((السنة)) (٨٦٣) وقال محققه الشيخ الألباني اسناده صحيح على شرطها .

(٢٧٦) أخرجه: أحمد في ((المسند)) (١١٠٠٠) .

(٢٧٧) أخرجه: الطبراني في ((المعجم الأوسط)) (٦٥١/٢) .

إنشاءالله)[٢٧٨].وه لە ڕوایوتێکدا: ((... **إننا كنا لنعلم إنك لتقول ذلـك** ...))[٢٧٩] . واتـه : ئێمە دەمان زانی كە تۆ وەڵامەكەت هـەروا دەبێـت ، وە لـە ڕوایەتێـكدا: (بـانگ كارێـك لـە ئاسمانـەوە بـانگ دەكـات ئـەوە درۆ دەكـات) ... ((**فافرشـوا لـه مـن النـار ـ والبـسوه مـن النار**))[٢٨٠]. واته : گۆڕەكەی پڕبكەن لە ئاگر وە پۆشاكی دۆزەخی ئاگری بەبەردا بكەن .. وە لە ڕیوایەتێكدا: ((**وأروه منزله من النار** ...))[٢٨١] . واتە: وە جێگەكەی خۆی لە دۆزەخ دا نیشان بدەن وە دەرگایەكی لە گۆڕەكەیەوە بۆ بكە نە سەر دۆزەخ ، تا گڕووهەڵاوی دۆزەخـی بەسـەردا دێت (پاشان دەرگایەكی بەهەشتی بۆ دەكرێتەوە و گـوڵ و گـوڵزاری بەهەشـت و ئەوانـەی كـە تیایەتی دەیبینێ)[٢٨٢] . وە لە ڕوایەتێكی تردا: (پـێی دەوترێـت ئەمـە جێگـەی تـۆ بـوو لـە بەهەشتدا كە خوای گەورە بۆی ئامادە كردبووی)[٢٨٣] . (ئەگەر بڕوات بە پەروەردگارت بهێنایە، ئەویش ئەوەندەی تر داخ و خەفەت دەخوات و هاوار دەكات)[٢٨٤] .

بەڵام دوای ئەوەی كافر بوویت بە خوای خۆت بزانە خوای گەورە ئەو جێگەیەی بەهەشتی بـۆ گۆڕیویت بەم جێگایە تەماشا بكە...((**ثم يفتح له بـاب مـن النـار** ...))[٢٨٥]. واتـه : پاشـان دەرگایەكی دۆزەخی بۆ دەكرێتەوە و [ **فينظرُ إليها يُحطمُ بعضها بعضاً** ][٢٨٦] دەبینێ چـۆن گـڕو كڵپەی دۆزەخ بەناو یەكدا دەچێت) . وە پێی دەڵێن : (([**عصي ربك واطعت وعـدوّك**] **هـذا مقعدك من النار وما أعد الله لك فيها فيزداد حسرةً و ثبوراً** ))[٢٨٧] . واته : تۆ سـەر پێـچی خوات كردو گوێڕایەڵی شەیتانت كرد ئائەوە ئەو جێگەیەیە كە خوای گەورە بۆی ئامادە كردویت

---

(٢٧٨) أخرجه : ابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٦٢) وابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٧) .

(٢٧٩) أخرجه : ابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٧) ، والشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٧٢٤) .

(٢٨٠) أخرجه: البيهقي في ((شعب الايمان)) (٣٩٥) وصحح إسناده .

(٢٨١) أخرجه : الحاكم في ((المستدرك)) (٣٨/١) .

(٢٨٢) أخرجه : ابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٦٨) .

(٢٨٣) أخرجه :ابن حبان في ((الصحيح)) : (٣١١٣) .

(٢٨٤) أخرجه: ابن حبان في ((الصحيح)) : (٣١١٣) .

(٢٨٥) اخرجه: أحمد في ((المسند)) (١١٠٠٠) ، وابن ابى عاصم في ((السنة)) : (٨٦٥) وقال محققه حديث صنحيح .

(٢٨٦) أخرجه : ابن ماجة في ((السنن)) (٤٢٦٨) .

(٢٨٧) أخرجه : ابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٣) ، والاجري (( الشريعة)) (٩١٢).

لە دۆزەخدا ، ئەنجا ئەوەندەی تر داخ و خەفەت دەخوات و هاوار دەکات پاشان بە زەوی دەوترێت وەرەوە یەك و بیگووشە. في رواية : ((... ثـم يُـضيّق عليـه قـبره ...))[٢٨٨] واتـە: گۆڕەکـەی لەسەر تەسك دەکرێتەوە ((... حتى تختلف فيها أضلاعه [من وراء صـلبه] ...))[٢٨٩] . هـەتا هەموو پەراسووەکانی لە پشتەوە تێك دەشکێنێت پاشان پیاوێکی ڕوخـسار ناشـرین وپۆشـاك ناشیرن و بۆن ناخۆش و بۆگەن دێت بۆلای و وە پێی دەڵێت : مژدەبێت بەوەی پێت ناخۆشـە ئـا ئەمە ئەو ڕۆژەیە کەهەڕەشەت لێ دەکرا و ئاگادار دەکرایتەوە لێ ی [ مژدە بێت بەڕسوایت لای خوا و سزایەکی هەتا هەتایی ]، ئەویش دەڵێت: تۆش خوا مژدەی شەڕت پێ بـدات تـۆ کێیـت ڕوخسارت لە ڕوخساری تاڵ و پیاوی شەڕانی دەچێت؟ لە وەلاّمدا بەو کافرە دەڵێت : مـن کـارە چەپەڵەکانی تۆم سوێند بە خوا ئەوەی من تۆم ناسیبێت زۆر سـست بوویـت لـە گـوێ ڕایـەڵی خواداو بە پەلەو خێرا بـووی لـە سـەر پێـچی کردنـی خـوادا ، خـوا سـزاو پاداشـتی کـردەوە خراپەکانت بداتەوە. ئەویش دەڵێت :

خوایە قیامەت نەهێنیتە پێش . چونکە دەزانێـت جێگـەی دۆزەخـە ، وە پێغەمبـەر(ﷺ) دەفەرموێت : پاشان فریشتەیەکی کەڕی کوێری لاڵی بۆ دادەنرێت کەچەکوشێکی یان گـورزێکی دۆزەخی پێ یە گەر بیکێشێت بە شاخێکی دنیادا ئەیکات بە خۆل دێت بۆ لای و یەك گورزی بەو شێوەی پیا دەکێشێت دەیکات بە خۆڵ پاشان خوای گەورە وەکو جاری یەکەمی لێ دەکاتەوە و ڕۆحی بە بەردا دەکاتەوە[٢٩٠] . پاشان گورزێکی تری پیا دەکێشێت بە نێـوان هـەردوو گوێیـدا واتە: بەسەر ناوەڕاستی سەریدا)[٢٩١]. دەفـەرموێت ((فيـصيح صـيحة يـسمعه كـل شـيء إلاّ الثقلين))... واتە: هاوارێکی لێ بەرز دەبێتەوە لەتاو ئازارەکەی کە هەموو شتێك لەوێ گوێی لێ دەبێت تەنها ئادەمیزاد و جنۆکە نەبێت[ فيذهب به إلى باب الأرض ] پاشـان دەبرێـت بـۆ

---

(٢٨٨) نفس المصدر السابق .

(٢٨٩) أخرجه : الترمذي في ((السنن)) (١٠٧١) ، وابن ابـى عاصـم في ((الـسنة)) (٨٦٤) ، والاجـري (( الـشريعة)) (٩١٢). وقال محققه : صحيح ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٧) .

(٢٩٠) انظر رواية : احمد (٨١/٣) و(٢٨٧/٤) ، و ابو يعلى (١٣٧٧) ، والحاكم (٤٠٤/٤) وصححه ووافقه الذهبي ، وابن ابـي الدنيا في ((صفة النار)) (٥٥) ، وصححه الشيخ الألباني في (( صحيح الترغيب)) (٣٥٥٨).

(٢٩١) إخرجه : البخارى في ((الصحيح)) (١٣٣٨) ، ومسلم في ((الصحيح))) (٢٨٧٠)

درگای زەوی وشۆڕ دەکرێتەوە و[ ويقول خزنة الأرض : ماوجدنا ريحاً انتن من هذا فتبلغ بها إلى الأرض السفلى ](٢٩٢) واتە: درگاوانی زەوی دەڵێن : تا ئێستا نەمان دیوە بۆنێکی بۆگەن تر لەمە ، شۆڕی دەکەنەوە هەتا دەیگەیەننە زەوی هەرخوار و [ حتى يأتوا به ارواح الكفار](٢٩٣) واتە: ڕۆحەکەی دەبەن هەتا دەیگەیەننە لای ڕۆحی کافرەکان لە هەرە خوارووداوەك دەفەرموێت[ نسمة الكفار في سجين ](٢٩٤) واتە: ڕۆحی بێ بڕوا (الكافر) کۆت و زنجیر دەکرێن لە یەکێك لە بەندیخانەکانی ئەوێدا...... ((ثم يفتح له باب من النار ويمهد من فرش النار...))(٢٩٥) واتە : پاشان دەرگایەکی دۆزەخی بۆ دەکرێتەوە هەموو سزای دۆزەخی پێ دەگەیەنرێت ئینجا فەرشی دۆزەخی بۆ ڕادەخرێت پاشان وە پێی دەوترێت: .... ((نم كما ينام المنهوش))(٢٩٦) واتە : بخەوە، وەك گازلێگیراو واتە چۆن یەکێك بخەوێت مار و دووپشك و

---

(٢٩٢) أخرجه: النسائي (٨/٤) ،والحاكم (٣٥٣/١) و صححه و وافقه الذهبي ، وابن حبان (٣٠١٣-٣٠١٤) وقال محققه : اسناده صحيح واللفظ له.

(٢٩٣) أخرجه : النسائي (٨/٤) ، وصححه الشيخ الألباني في (( صحيح النسائي )) (١٧٢٩).

(٢٩٤) أخرجخ: البيهقي (( البعث )) (٢٠٥) وراه نحوه : الطبراني ((الكبير)) (٦٦/١٩) ، والحميدى ((المسند)) (٣٨٥/٢).

(٢٩٥) حديث البراء بن عازب الطويل أخرجه : أحمد في ((المسند)) (٢٩٥/٤-٢٩٧) رقم : (١٨٥٣٤) وقال محققه الشيخ الأرناؤط : إسناده صحيح ، وأبو داود في((السنن)) (٨/٤) ، و النسائي في ((السنن الكبرى)) (١٩٥٩) ، وابن ماجة في ((السنن)) (١٥٤٨) مختصرا ، و الطبرى في ((جامع البيان)) (١٢٩/٨) رقم : (٢٠٧٦٤) ، وابن أبي شيبة في ((المصنف)) (٣٧٤/٣) ، والطبراني في ((الأحاديث الطوال)) (٣٥) ، و ابن المبارك في ((الزهد)) رقم (١٢١٩) ، و الطيالسي في ((المسند)) (٧٥٣) ، و الدارمي في ((الرد على الجهمية)) (١١٠) وقال محققه : اسناده صحيح ، و الحاكم في ((المستدرك)) (٣٧/١) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبى ، والبيهقى في ((إثبات عذاب القبر)) (٢٧) وفي ((شعب الإيمان)) رقم (٣٩٥) وقال حديث صحيح الإسناد،وصححه البوصيري في (( اتحاف الخيرة المهرة )) (٢٥٣٤-٢٥٣٥) وقال شيخ الإسلام ابن تيمية في ((مجموع الفتاوى)) (٤ /٢٩٠) حديث حسن ثابت ، وصححه ابن قيم الجوزية في ((أعلام الموقين)) (٢١٤/١) ، وتهذيب السنن (٣٣٧/٤) ،وفي كتاب ((الروح)) (ص: ٧٦) نقل تصحيح أبى عوانه و أبى نعيم ، وقال الإمام القرطبى في ((التذكرة)) (٢٠٨/١) حديث صحيح ، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) : (٤٩/٣) رجاله رجال الصحيح ،وصححه السيوطى في ((شرح الصدور)) (ص : ٥٥) وفي ((تخريج احاديث شرح العقائد)) (٩)، وقال العلامه الشيخ الألباني في ((أحكام الجنائز)) (ص : ٢٠٢) وفي (( صحيح الجامع)): (١٦٧٦) ، وفي ((مختصر العلو)) (٩) حديث صحيح على شرط الشيخين . وأخرجه أيضاً اللالكائى (٢١٤٠) ، والرويانى (٣٩١) ، وقال الشيخ مقبل في : ((الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين)) (١٥٠) : حديث حسن ، وقال أيضاً في ((الجامع الصحيح)) (٤٠٤/٦) : حديث صحيح .

(٢٩٦) أخرجه : البزار في ((المسند)) (٨٧٤) ،وحسن إسناده الشيخ الألباني في ((الآيات البينات)) (ص: ١٠٥) .

زەردەواڵە هەرچی جرو جانەوەر هەیە گازو قەپی لێ بگرن و بیگەستن و ئازارێکی زۆری پێ بگات و نەتوانێت لە خەو هەڵسێت چەند ناڕەحەتە ئەویش بەو جۆرەیە؟(والله أعلم).ابن مسعود(ﷺ) دەفەرموێت : " **وتبعث عليه حيات من حيات القبر كاعناق الابل فاذا خرج قمح بمقمح من نار و حديد**" (٢٩٧). واتە: هەندێك ماری ناوگۆری بۆ دەنێرێت وەك ملی حوشتر گەورەن هەر ویستی لەوان ڕابکات بە چەکوش وگورزەی ئاگر لێ ی دەدرێ.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت :((**فلا يزال فيها معذبا حتى يبعثه الله من مضجعه ذلك...**))(٢٩٨) واتە : بەو شێوەیە بە سزادانەوە دەمێنێتەوە تا خوای گەورە زیندووی دەکاتەوە لە گۆڕەکەیەوە .

# جۆرەکانی سزای ناو گۆڕ

لە هەندێك فەرموودەی تردا چەندین جۆری سزای تر هاتووە لەوانە:

عائشە (رضي الله عنها) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیگێرێتەوە: ((**يرسل على الكافر حيَّتان واحدة من قبل رأسه والأخرى من قبل رجليه يقرصانه قرصاً كلما فرغتا عادتا إلى يوم القيامة**))(٢٩٩) واتە کافر دوو ماری بۆ دەنێردرێت یەکێکیان لای سەریەوەو ئەوی تریان لای قاچی یەوە گازی لێ دەگرن و دەیگەستن هەتا هەموو لاشەی پارچە پارچە دەخۆن کە تەواوبوو دووبارە لاشەی درووست دەبێتەوە و ئەوانیش دیسان بەو شێوەیەی پێشتری لێ دەکەن تا ڕۆژی قیامەت ... لە ڕیوایەتێکی تردا: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : ئەزانن ئەم ئایەتە لەسەر کێ دابەزیووە ؟ ((... **فإن له معيشة ضنكا ونحشره يوم القيامة أعمى**)) فەرمووی ئایا دەزانن ((**معيشة ضنكا**)) چی یە ؟ هاوەڵەکان ووتیان: خواو پێغەمبەری خوا باشتر دەزانن ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : ((**عذاب الكافر في قبره والذي نفسي بيده إنه يُسلط عليه**

---

(٢٩٧) أخرجه: الاجري ((الشريعة)) (٩١٨) وقال محققه :حسن.

(٢٩٨) أخرجه : ابن حبان في ((الصحيح)) (٣١١٧) وقال محققه اسناده قوي ، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٧٢٤).

(٢٩٩) أخرجه: احمد في((المسند)) (١٥٢/٦) برقم (٢٥١٨٩) وقال محققه الأرناؤوط : اسناده ضعيف، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) : (٥٥/٣) رواه أحمد وإسناده حسن .

تسعة وتسعون تنيناً أتدرون ما التنين سبعون حية يلسعونه ويخد شونه إلى يوم القيامة ))[٣٠٠]
واته : ئەوە ژیانی ناڕەحەت و دژواری کافرە لە گۆڕدا سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە ، نەوەت و نۆ (تنین) پەلاماری دەدەن ، ئایا دەزانن (تنین) چی یە؟ ئەو هەژدیهایەیە کە حەفتا سەری هەیە . لە هەموو لایەکەوە دەیگەستن و گازی لێ دەگرن و برینداری دەکەن هەتا ڕۆژی قیامەت. لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : لە ئەسمائەوە (رضي الله عنها) مرفوعاً: (....تسلط عليه دابة في قبره [سوداء مظلمة ]معها سَوط...)[٣٠١]. واته : ئادەمیزادی بێ باوەڕ لە گۆڕەکەیدا ئاژەڵێکی کەڕ و ڕەشی بەسەردا زاڵ دەکرێت قامچی یەکی پێ یە سەرەکەی گورزێکە ئەو گورزەش یەك پشکۆ ئاگرە بە ئەندازەی ووشترێکە لێ ی دەدات و کەس گوێی لێ نیە تا ڕەحمی پێ بکات و بەزەیی پێا بێتەوە . لە ڕیوایەتێکی تردا عائشه (رضي الله عنها) دەفەرموێت : (( إن الكافر يُسلط عليه في قبره شُجاع أقرع يأكل من رأسه حتى ينتهي إلى قدميه ، ثم يُكسى لحماً فيأكلهُ من قبل قدميه [ حتى ينتهي به إلى رأسه ثم يعاد فيعدو حتى ينتهي إلى [ قدميه ] ثم كذلك ] ...))[٣٠٢] واته: ئادەمیزادی بێ باوەڕ لە گۆڕکەیدا مارێکی سەر ڕووتاوی دوو شاخداری دڕندەی بە سەردا زاڵ دەکرێت ، لە سەریەوە دەست بە خواردنی لاشەی بێ باوەڕکە دەکات هەتا هەر دوو قاچی پاشان لاشەکەی بۆ دروست دەکرێتەوە ، و ئەویش دەست دەکات بە خواردنی لە قاچیەوە هەتا سەری و بەو شێوەیەش ئەم سزایەی بۆ بەردەوام دەبێت.

عەبدوڵای کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) سەبارە بە مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە :﴿ .......سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ....... ﴿١٨٠﴾ ﴾ (آل عمران: ١٨٠) دەفەرموێت : (( ثعبان له زبيبتان ينهشه في قبره – وفي رواية [ فينقرَ في رأسه ثم يتطوق في عنقه ثم ] يقول : أنا مالك الذي بخلت

(٣٠٠) أخرجه : الطبري في ((التفسير)) (٢٢٨/١٦) ، والبزار في (( المسند)) (٢٢٣٣) ، و الاخرى (( الشريعة )) (٨٩٥)، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣١٢٢) وقال محققه : إسناده حسن ، وحسنه الشيخ الألباني في (( صحيح الترغيب )) (٣٥٥٢).

(٣٠١) أخرجه:أحمد في ((المسند)) (٣٥٢/٦) ، والطبراني في ((المعجم الكبير)) (٢٨١/٢٤) ، وحسنه الحافظ العراقي في ((تخريج الأحياء)) (٢١٥/٣) ، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (٥١/٣) رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح.

(٣٠٢) أخرجه: عبد الله بن أحمد بن حنبل في (( السنة)) (١٤٦٨)، و قال محققه : اسناده صحيح .

بە))[٣٠٣] . واتە: دوو ماری شاخ دار دەیگەستن لە گۆڕەکەیدا — لە ڕیوایەتێکی تردا — گاز دەگرێت لەسەری و پاشان خۆی پێچ دەدات لە ملیەوە و پێی دەڵێت : من سامانەکەی تۆم کە چروکیت کردوو نەت بەخشی .

## سزاکانی ناو گۆڕ

**إبن أبی العز الحنفی** (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت : (باش بزانن سزای گۆڕ سزای بەرزەخە هەرکەسێك بمرێت و شایەنی ئەو سزایە بێت کافر بێت یان موسوڵمان هەردەبێت ئەو سزایەی پێ بگەیەنرێت ئەگەر لە گۆڕنرابێت یان دڕندە خواردبێتی یان سووتابێت یان بووبێت بە خۆڵەمێش و بای بە هێز بردبێتی و بلاوی کردبێتەوە یاخود لە ناو ئاودا خنکا بێت و شی ببووبێتەوە هەرهەمان ئەو سزایەی لە گۆڕنراو دەگاتە ڕۆح و لاشەکەی)[٣٠٤] . پێغەمبەر(ﷺ) پێی ڕاگەیاندووین کە ئێمە گوێمان قورسەو گوێمان لە سزای ناو گۆڕ نیە ، بەلاّم ئاژەڵ گوێی سووکە و گوێی لێ یە ، وە دەفەرموێت :(( **إن الموتى لیُعذَّبون في قبورهم حتى إنَّ إلبهائم [ کلها] لتسمع اصواتهم** ))[٣٠٥] واتە: مردووەکان سزا دەدرێن لەناو گۆڕەکانیاندا هەتا گیان لەبەرانیش گوێیان لە دەنگیانە. وە هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) جارێکیان سواری ئێسترە سپی یەکەی خۆی بوو وە بەلای باخە خورماکەی (بەنی نەجار) دا ڕۆی هەندێ گۆڕی تیابوو کە ئێسترەکە نزیك گۆڕەکان بۆوە سڵەمی یەوە و چووە دواوە و خەریك بوو پێغەمبەر(ﷺ) بکەوێتە خوارەوە پاشان فەرمووی: (( **لولا أن تدافنوا لدعوتُ الله أن یُسمعکم عذاب القبر الذي اسمع منه** ))[٣٠٦] واتە : گەر لە ترسی ئەوە نەبێت کە نەوێرن لێرە بە دواوە مردوو بنێژن ، ئەوا داوام لە خوا دەکرد ئەو سزای ناو گۆڕەی ئێستا من گوێم لێیەتی ئێوەش گوێتان لێ بوایە. وە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت :( پێویستە لەسەر موسوڵمان لە دوای هەموو (تحیات)ی

---

(٣٠٣) أخرجه الطبراني (( الكبير )) (٩١٢٤) ، و عبد الرزاق (( المصنف )) (١٤١/١) ، و ابن ابي شيبة (( المصنف )) (٢١٣/٣) و الطبراي ((التفسير )) (٨٢٨٥) وسعد بن المنصور (( السنن )) (٥٤٩) . و الحاكم (٢٩٨/٢) وصححه على شرط الشيخين ووافقه الذهبي و قال محققه (( المستدرك )) (٣٢٢٣) : اسناده صحيح.

(٣٠٤) انظر: ((شرح العقيدة الطحاوية)) (٥٧٩/٢) .

(٣٠٥) أخرجه: البخاري ( ٦٣٦٦ ) ، والطبراني (الكبير) واللفظ له ، و أحمد (٣٦٢/٦) ،وابن حبان (٣١٢٥) وقال محققه : اسناده صحيح ، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب) (٣٥٤٨).

(٣٠٦) أخرجه : أحمد (١٩٠/٥)، ومسلم (٢٨٦٧).

کۆتایی نوێژدا پەنا بگرێت بە خوا لەچەند شتێك یەکێك لە وانە پەنا بگرێت بە خوا لە (سزای گـۆڕ))[٣٠٧] . دایکـی موسـوڵمانان عائیـشە (رضـي الله عنهـا) دەفـەرموێت: (ئـەم دیـوە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژێك بکات و پەنا نەگرێت بە خـوا لـە سـزای گـۆڕ)[٣٠٨] . وە لـە هـەموو نوێژێکدا دوو بارەی کردۆتەوە.

## هەندێك لەو کارانەی کە مووسڵمان لەسەری سزا دەدرێت لەناو گۆڕدا[٣٠٩]

**یەکەم : درۆکردن وپشت گوێ خستن و لەبیرچوونەوەی قورئان و نوستن لە نوێژە فەرزەکان دا و زیناکردن سووخواردن .**

لە (سەمرەی کوڕی جوندب) ەوە (ﷺ) (دەفەرموێت : زۆرجار پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی دەفەرموو : ((هل رأى أحد منكم [ الليلة] رؤيا ؟)) واتە : کـەس لـە ئێـوە ئەمـشەو خـەوی بینیوە ـ دیارە هەرکەسێك خەوی ببینیایە دەیگێڕایەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش بـۆی لێـك دەدایەوە ـ بەرەبەیانێك بوو بۆی گێڕاینەوەو فەرمووی: ((أتاني الليلة آتيـان)) لـە ڕیوایـەتێکی تردا [ رجلان] واتە : ئەم شەو دووپیاو هاتن بۆ لام هەڵیانساندم ـ وە هەر دوو دەستیان گرتم ووتیان : وەرە لەگەڵماندا تا گەیاندمیانە خاکی پیرۆز لەوێ گەیشتین بە پیاوێـك پـاڵ کـەوتبوو

---

(٣٠٧) أخرجه : أحمد (٢/٢٣٧) ، ومسلم (٥٨٨) ، و أبوداود (٩٨٣) ،والنسائي (٣/٥٨).

(٣٠٨) أخرجه: البخاري (٦٣٦٦) ،وابن أبى عاصم في ((السنة)) (٨٧٤) ، وقال محققه الشيخ الألباني إسناده صحيح على شرطهما، والدينوري ((المجالسة)) (٢٣٤٩) وقال محققه : اسناده حسن والحديث صحيح.

(٣٠٩) ئەی موسڵمان بێ باك وخەم سارد مەبە لە سزای خواو هەمیشە لەترسدابە ، وەك ئبن قەیم دەفەرموێت : (ئەی ئەوکەسەی کە هیواو ئاواتەکانت فریویان داویت ئاگاداربە : ئیبلیس نەفرەتی لێ کرا لەبەر ئەنجام نەدانی تەنها یەك سوجدە ، وە ئـادەم دەرکرا لەبەهەشت تەنها لەبەر خواردنی یەك پاروو ، وەبکوژ (قاتل) تەنها بەهۆی یەك مشت خوێنەوە کە ڕشتویەتی ڕسـوا دەکرێت و دەکرێتە ناو جەهەنەمەوە ، وە خوای گەورە فەرمانی داوە بەکوشتنی زیناکار بەخراپترین جـۆری کوشـتن بـەهۆی کردنە ناوەوەی تەنها سەرە پەنجەیەك لەوانەی حەڵاڵ نین بۆی ، وە فەرمانی داوە بە قەمچی پشتی ئەو کەسە سور بکرێتەوە لەسەر تەنها وشەیەکی بوختان یاخود بەهۆی خواردنەوەی تنۆکێ مەیەوە (عرق) وە ، وە فەرمانی داوە بـەلێ کردنـەوەی ئەندامێك لە ئەندامەکانت تەنها لەبەر دزینی سێ درهەم پارە ، وە ئافرەتێکی خستە ناو ئاگرەوە تەنها لەبەر پـشیلەیەك ، وە پیاوی وا هەیە تەنها لەبەر یەك ووشە کەلای خۆی بایەخدار نی یە پێی دەچـێتە نـاو دۆزەخـەوە) بڕوانـە : ((الفوائـد)) لاپەڕە (١١٥) .

یەکێك بە سەریەوە بوو تاشە بەردێکی بە دەستەوە بوو دەیکێشا بە کەللەی سەریدا و بەردەکە بەرز دەبووەوە و دەڕۆی لەسەختی پیاکێشانیدا، سەری دوو کەرت دەکرد وە خوێنی لێ دەر دەچوو وە کەللەی سەری دە تەقاند بە بەردەکە و ئەو پیاوەش دەچوو بەردەکەی دەهێنایەوە و ئەویش کەللەی سەری وەکو خۆی لێ دەهاتەوە ، دیسانەوە دەیکێشایەوە بە سەریدا و بەم شێوەیە لە سەر یەك ئەم لێ دانەی دووبارە دەکردەوە .

دەفەرموێت : ووتم (سبحان الله) ئەوە چی یە؟ ئەم دوانە چین ؟ پێ یان ووتم : بڕۆ بڕۆ...تا گەیشتین بە پیاوێك لەسەر پشت کەوتبوو یەکێکیش بەسەر سەریەوە وەستابوو، قولاپێکی ئاسنی بەدەستەوە بوو دەیکردبە لاشەویلگەیدا و هەڵیدەقلیشاند تاکو پشتە سەری وە قولاپە ئاسنەکەی دەکرد بەلووت و چاویدا تاکو پشتە سەری هەڵیدەقلیشاند پاشان ئەیخستە سەر ئەولای تری بەهەمان شێوە چی لەو لایەی تری کردبوو ئەو لایەشی وا لێ دەکرد ، تا لایەکی وا لێ دەکرد لاکەی تری چاك دەبۆوە وە بەردەوام ئەم لاو ئەولای هەڵدەقلیشاند و ئەمەی دووبارە دەکردەوە ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : ووتم ئەوە چی یەئەم دوانەچین ؟ پێیان ووتم بڕۆ بڕۆ. ڕۆیشتین تاکو گەیشتینە جێگەیەك وەکو تەنوور وابوو سەرەوەی فراوان بوو وخوارەوەی تەسك بوو لە ژێرەوە ئاگریان پێوە دەنا کە سانێکی تێدا بوون.ئەو ئاگرە گەورەیان لەژێرەوە بۆ دەهات بەرز دەکرانەوە تاکو سەرەوە وەختەبوو لە تەنوورەکە بێنە دەرەوە و دەستیان دەکرد بە هاوار هاوار و دەنگە دەنگ منیش لە تەنوورەکە نزیك بوومەوە تەماشای ناوەکەیم کرد بینیم پیاوانێك و ئافرەتانێکی ڕووتی تیابوو کە ئەو گڕەگەورەیان بۆ دەهات دەستیان دەکرد بە هاوار هاوار و ئەوەش دووبارە دەبووەوە ووتم :((**سبحان الله**)) ئەی ئەمانە چین؟ پێ یان ووتم بڕۆ بڕۆ، ڕۆیشتین تاکو گەیشتینە ڕووبارێکی سوور وەك خوێن وابوو تەماشام کرد لە سەر قەراغی ئەو ڕووبارە یەکێك دانیشتووە و بەردێکی یەکجار زۆری لای خۆی کۆکردۆتەوە و کابرایەکیش لە ناو ڕووبارەکەدا مەلەی دەکرد هەتا زۆر ماندوو دەبوو کە ئەگەیشتە ڕۆخی ڕووبارەکە لای ئەو پیاوە دەمی دەکردەوە و ئەو پیاوەش یەك بەردی زلی دەکردە ناو دەمیەوە و ئەوەندەی تر قورس دەبوو هەر بەو شێوەیە مەلەی دەکردلەو ڕوبارەدا تا ماندو دەبوو کە ماندووش دەبوو دەهاتەوە و ئەو پیاوەش بەردێکی تری دەخستە ناو دەمیەوە بەو شێوەیە بەردەوام دەبوو وە منیش ووتم ئەی ئەمەیان چی یە ؟ پێ یان ووتم بڕۆ بڕۆ.. تا گەیشتینە پیاوێکی ڕوخسار ناشرین ئاگرێکی

لە نزیکەوە بوو ئاگرەکەی زیاتر جۆشدەدا بۆ ئەوەی زیاتر گڕ بسێنێت و بڵێسە بدات وە بە چواردەوریدا هەڵدەسوڕا ، ووتم ئەی ئەمە کێ یە ؟ ووتیان بڕۆ بڕۆ ... دەفەرموێت ڕۆیشتین تا گەیشتینە باخێکی یەکجار سەوز پڕبوو لە هەموو گوڵ وگوڵزارێکی بەهار، لە ناو باخەکەدا دارێکی یەکجار گەورەی تیابوو لە بنی دارەکە پیاوێکی بەتەمەنی بالاَ بەرزی تیابوو ئەوەندە بەرز بوو سەری دیار نەبوو لەئاسماندا ، لە چواردەوری ئەو پیاوە ژمارەیەکی یەکجار زۆر منداڵ هەبوو کە لە ژیانمدا ژمارەی زۆری وام نەدیبوو پێم ووتن ئەمە چی یە ؟ ووتیان بڕۆ بڕۆ ، ڕۆیشتم لە گەڵیاندا تا گەیشتمە باخێکی یەکجار گەورە لەوە گەورەترم نەدیووە جوانترو ڕازاوەتربێت، پێیان ووتم : بەرز بەرەوە وە لە دارەکە بەرزیان کردمەوە ، بردمیانە ناو خانوویەکەوە شوێنی وا هەرگیز خۆشم نەدیوە لە ژیانمدا پیاوی بەتەمەن و گەنج وئافرەت و منالی تیا بوو پاشان دەریان کردم لەوێ و زیاتر بەرزیان کردمەوە لە دارەکە و گەیاندمیانە جێگەیەکی لەوە خۆشتر پیاوی پیرو گەنجانێکی لێ بوو بەرز بوومەوە تێیدا)[٣١٠] (وە ئەوانیش هاتن لە گەڵمدا تا گەیشتینە شارێك کە دیوارەکانی لە خشتی ئاڵتون و زیو درووست کرابوو چووینە دەرگای شارەکەو لە دەرگامان دا و داوای چوونە ژوورەوەمان کرد و چووینە ژوورەوە بینیمان پیاوانێك دەهاتن بەرەو ڕوومان نیوەی لاشەیان زۆر جوان بوو وە نیوەکەی تریان زۆر ناشرین بوو ئەو دووانەی لەگەڵمدا بوون پێ یان ووتن: بڕۆن خۆتان بخەنە ئەو ڕووبارەوە ، تەماشام کرد ڕووبارێکە لە بەردەمانەوە دەڕوات ئەو ڕووبارە یەکجار سپی یەکی تۆخ بوو ئەوان چوون خۆیان خستە ناو ئاوەکەوە و پاشان لە ئاوەکە هاتنە دەرێ و هاتنەوە بۆ لامان ئەو پیسی و ناشرینیەیان لەسەر نەمابوو یەگجار جوان بووبوون ئینجا پێیان ووتم : ئەمە بەهەشتی عەدنە [ کە یەکێکە لەبەهەشتە فراوانەکان ] ئائەوە جێگەی تۆیە . پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت کە تەماشام کرد و چاوم بەرز کردەوە کۆشکێکی گەورەم بینی وەك پەڵە هەورێکی سپی گەورە دیاربوو دیسان ووتیان ئائەوە جێگەی تۆیە منیش ووتم دەرێگەم بدەن با بچمە ناوی ، ووتیان: ئێستا نەخێربەلاَم تۆ دەچیتە ناوی جارێ هەندێك لەتەمەنت ماوە لە ژیاندا تەواوی دەکەی پاشان دەچیتە ناوی، ئینجا پێم ووتن لە سەرەتای ئەم شەوەدا شتی یەگجار سەیرم بینی ئەوانە

---

(٣١٠) أخرجه : البخاري في ((الصحيح)) (١٣٨٦)

چی بوون ؟ پێیان ووتم : بەڵی ئێستا پێت ڕادەگەیەنین : پیاوی یەکەم کە بینیت تاشە بەردەکەی دەکێشرا بەسەریدا ئەوە پیاوێك بوو قورئانی لەبەر دەکردو لە بیر خۆی دەبردەوە یان بە شەو قورئانی وەردەگرت و بە ڕۆژ کاری پێ نەدەکرد وە دەخەوت و نوێژە فەرزەکانی دەچواند. ئەوە حاڵی دەبێت تا ڕۆژی قیامەت) [٣١١] (واتە لە ژیانی بەرزەخدا).وە ئەو پیاوەی کە قولاپ لە شەویلگە و لوت و چاوی دەچەقێنراو هەڵدەقلیشێنرا هەتا پشتەملی ئەوە کابرایەکی درۆزن بوو پڕ و پاگندەی درۆی بڵاودەکردەوە، وە ئەو درۆیە لەوەوە بڵاودەبۆوە دەگەیشتە شوێنانی دوور بەو شێوەیەی لێ دەکرێت تا ڕۆژی قیامەت ، وە ئەو پیاوان و ئافرەتانەی ڕووت بوون کە بینیتن لەو جێگەیەدا بوون وەکو تەنوور ئەوانە زیناکار بوون ،وە ئەو پیاوەی لەناو ڕووبارەکە مەلەی دەکرد و بەرد دەخرایە ناو دەمی سوو خۆر بووە لە ژیانیدا ،وە ئەو ڕوخسار ناشرینەی کە ئاگرەکەی کردبۆوە و بە چواردەوری دا دەهات بۆ ئەوەی نەکوژێتەوە و بڵێسەی پێ ئەدا ئەوە مالیکی لێپرسراوی دەرگاوانی دۆزەخە، وە ئەو پیاوەباڵا بەرزەی ژێر دارەکە ئەوە ئیبراهیم (علیه السلام) بوو، وە ئەو منداڵانەش منداڵی خەڵکی بوون ،[لە ڕیوایەتێکی تردا: هەندێك لە موسوڵمانان ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا : منداڵی موشریکەکانیش ، ئەویش فەرمووی: بەڵێ] . وە یەکەم ماڵ کە چوویتە ناوی ئەوە جێگەی باوەڕدارانە بە گشتی، وە ماڵی دووەم کە بینیت لە جێگەی یەکەم خۆشتر بوو جێگەی شەهیدانە ، وە ئەو پیاوانەی کە بینیتن لایەکیان پیس و ناشرین بوو وە لاکەی تریان جوان بوو ئەوانە کاری چاکەیان تێکەڵ بە کاری خراپە کردبوو خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانیان خۆش بووە ، وە منیش (جبریل)م وە ئەویش (میکائیل)ە) [٣١٢].

**دووەم : زمان پیسی وباسی پاشەملەو گواستنەوەی قسە لەنیوان خەڵکیدا بۆ تێکدانی نێوانیان و خۆ پاك ڕانەگرتن لە میز.** ئیبن و عەباس (رضي الله عنه) دەفەرموێت:(پێغەمبەر(ﷺ) بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕی و فەرمووی ((إنهما يعذبان وما يعذبان في كبير ، بلى إنه كبير أما

---

(٣١١) وفي رواية : ((ذلك الرجل تعلم القرآن فنام عنه حتى نسيه لايقرأ منه شيئا ، كلما رقد دقوا رأسه في القبر الى يوم القيامة ولا يدعونه ينام)) واتە : ئەوە پیاوێکە قورئان فێر بووە و نایخوێنێتەوە تاوەکو لە بیری دەچێتەوە ئینجا هەرکاتێك بیەوێت بخەوێ دەیکێشن بە سەریدا لە گۆڕەکەیدا تا وەکو ڕۆژی قیامەت . هذا أخرجه :(الدار القطني) كما في ((شرح الصدور)) (ص : ١٦٧) وفي ((اهوال القبور)) (ص:٧٤) .

(٣١٢) أخرجه : البخاري في ((الصحيح)) (١٣٨٦-٧٠٤٧)

**أحدهما فكان يمشي بالنميمة وأما الآخر فكان لايستتر من بوله..))** [٣١٣] واتـە: ئـەو دوانـە ئێستا سزا دەدرێن لەسەر شتێكی بچوك بەلای ئێوەوە بەلاّم لە ڕاستیدا گەورەیـە... یـەكێكیان دوو زمانی دەكرد و ئەوی تریان خۆی پەنانەئەدا لەكاتی میزكردندا و لە پـێش چـاوی خـەڵكی میزی دەكرد .

لە ڕیوایەتێكی تردا : **((... أما أحدهما فكان يغتاب الناس وأما الآخر فكان لا يتأذى من البول...))** [٣١٤] واتە: یەكێكیان غەیبەتی خەڵكی دەكرد و ئەوی تریان لە پاشە میز خۆی نەدەپاراست .

(ئیبن عەباس) (رضي الله عنه) : گێڕاویەتی یەوە كە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی: **((عامـة عـذاب القبر في البول فاستنزهوا من البول ...))** [٣١٥] واتە : زۆربەی سزای گـۆڕ بـەهۆی میزەوەیـە ، كەواتە خۆتان پاك ڕابگرن لە میز .

(أبو هريرە) (رضي الله عنه) دەفەرموێت : لە خزمەت پێغەمبەر دا بووین (ﷺ) تێپەڕین بەلای دوو گۆڕدا ، پێغەمبەر(ﷺ) وەستا و ئێمەش وەستاین لە خزمەتیدا سەیری ئەو دوو گـۆڕەی كـردو ڕەنگی تێك چوو وە لەشی هاتە لەرزەهەتا كراسەكەی سەر دەستی هاتـە لـەرزە ، ووتمـان ئـەی پێغەمبەر خوا (ﷺ) بۆ وات لێ هات ؟ فەرمووی : (ئەوەی من گوێم لێ یە ئێوەش گوێتان لێ یە؟ ووتیان: چیت گوێ لێ یە ئەی پێغەمبەر خوا (ﷺ) ؟ فەرمووی:

**(( هذان رجلان يُعذبان في قبورهما عذاباً شديداً في ذنبٍ هيّنٍ ))** . واتە: ئەوە دوو پیـاون سزادەدرێن لە گۆڕە كانیان دا بە سزایەكی توند لەسەر تـاوانێكی سـووك . ووتمـان : لەسـەر چ تاوانێك ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی : **(( كان أحدهما لايستنزهُ من البـول وكـان الأخر يؤذي الناس بلسانهِ ويمشي بيـنهم بالنميمـة ))** واتـە: یـەكێكیان خـۆی لـە میـز پـاك

---

(٣١٣) أخرجه : البخاري في ((الصحيح)) (٢١٨) ، ومسلم في ((الصحيح)) (٢٩٢).

(٣١٤) أخرجه : البخاري في ((الأدب المفرد)) (٧٣٥) ، وابن أبى الدنيا في ((الصمت)) (١٧٦) وقال محققه : حديث صحيح، صححه لغيره الشيخ الألباني في ((صحيح الأدب المفرد)) (٥٦٤) .

(٣١٥) أخرجه : البزار في ((المسند)) (٢٤٣) ، والطبراني في ((المعجم الكبير)) (١١١٢٠) ، والحاكم في ((المستدرك)) (١٨٣/١) ، والدار القطني في ((السنن)) (١٢٨/١) رقم (٤٦٠) وقال : لابأس به ـ وقال محققه : إسناده حسن ، وصحح اسناده الحافظ في ((بلوغ المرام)) صفحة (٣٢) ، وقال البوصيري في ((مختصراتحاف السادة المهره) (٤٩٢): إسناده حسن، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب والترهيب)) (١٥٢)، وفي ((صحيح الجامع)) (٣٨٦٦).

ڕانەدەگرد، وە ئەوی تریان ئازاری خەڵکی دەدا بە زمانی و جوێنی پێدەدان ، وە جگـە لـەوەش دوو زمانی لە نێوانیاندا دەکرد...)[٣١٦].

**سێهەم : نوێژ کردن بەبێ دەست نوێژ و سەر نەختنی ستەم لێکراو:**

(ئیبن و مەسعود) (رضي الله عنه)دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (فـەرمان درا یەکێك لە بەندەکانی خودا سەد شەلاقی لێبدرێت لە گۆڕەکەیدا ئەو مردووە بەردەوام دەپاڕایەوە تا بۆی کرا بەیەك شەلاق کە لێی درا گۆڕەکەی هەرهەموو کلپەی کردوو گـڕی تێبـەربوو کـاتێ کابرا هۆشی هاتەوە خۆی ، ووتی بۆچی ئەم یەك جەڵدەتان لێـدام ؟ ووتیـان: (( **إنـك صـليت صلاة واحدة بغير طهور ومررت على مظلومٍ فلم تنصره** )) واتە:چونکە تۆ تەنها یەك نوێژت کرد بەبێ دەست نوێژ، وەبەلای ئادەمیزادێکی ستەم لێکراودا ڕەت بوویت و سـەرت نەخـست ، وە ستەمت لێ دوور نەختەوە .)[٣١٧] .

**چوارەم : قسەکردن بەبی شارەزایی لەباسێکدا[٣١٨] ، وە بەدرۆخـستنەوەی ئـەوی کەچـاو دەیبینێ و گوێ دەیبیـستێ ، وە ڕۆژووشـکاندن پـێش کـاتی خـۆی ، وە ئـەو دایکانـەی منداڵەکانیان بێ بەش دەکەن لەشیری خۆیـان .**

(ئەبی ئومامە) (رضي الله عنه) دەفەرموێت : (پێغەمبەر(ﷺ) دوای نوێـژی بـەیانی هاتـە ناومـان فەرمووی : ئەمشەو خەوێکم بینی ڕاست و ڕەوایە لێ ی بە ئاگابن و تێـی بگـەن لـە خەومـدا پیاوێك هات دەستی گرتم و دوای خۆی خستم تا گەیاندمی یە بەردەم شاخێکی بەرزو هەڵـدێر ، پێ ی ووتم سەر کەوە ووتم ناتوانم ، ووتی بۆت ئاسان دەکەم ، دەفەرموێت: هەر پێ یەکم دەنایە شوێنێکی شاخەکە زۆر بەرز دەبوومەوە و هەر پێ یەکی ترم دادەنا زۆرتر بەرز دە بوومـەوە تـا گەیشتمە لووتکەی شاخەکە پاشان بەرێکەوتین گەیشتین بە پیاوانێك و ئافرەتانێك کە دەمیان لە

---

(٣١٦) أخرجه : ابن حبان في ((الصحيح)) (٨٢٤) وقال محققه : إسناده صحيح ، وصـححه الـشيخ الألبـاني في ((صـحيح الترغيب والترهيب)) (١٥٧).

(٣١٧) أخرجه: الطحاوي في ((مشكل الآثار)) (٢٣/٤) ،وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٧٧٤) .

(٣١٨) إشـارة الى الآيـة الكريمـة:﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولٗا ٣٦ ﴾ (الإسراء: ٣٦)

هەموولایەکەوە هەڵقلیشێنرابوو ، ووتم ئەوانە کێن؟ ووتی : ئەوانە کەسانێکن کە بەبێ زانیاری و شارەزایی لە خۆیانەوە باسی شت دەکەن (والله أعلم). پاشان ڕۆیشتین و تێپەڕین بەلای کۆمەڵێکی تردا لە پیاوان و ئافرەتان کە بزمار ومێخ دا کوترا بوو بەچاو وگوێیاندا ، ووتم : ئەی ئەوانە کێن ؟ ووتی : ئەوانەن کە درۆیان کردووەو ئەوەی بە چاوی خۆیان نەیان دیوە دەڵێن: بەچاوی خۆمان بینیومانە ، وە ئەوەی بە گوێ ی خۆیان نەیان بیستوە دەڵێن : بە گوێی خۆمان بیستمان و گوێمان لێ بوو. پاشان ڕۆیشتین تا گەیشتینە لای ئافرەتانێک کە بە پاژنەی پێ هەڵواسرابوون سەریان بەرەو خوار کرابوو، مار ئەهات و گازی لە مەمك وسەرسنگیان دەگرت ووتم: ئەوانە کێن ؟ ووتی: ئەو دایکانەن کە منداڵەکانیان بێبەش دەکەن لەشیری خۆیان، دەفەرموێت پاشان لەوێوە تێپەڕین و ڕۆیشتین تا گەیشتین بە پیاوانێك و ئافرەتانێك کە بە پاژنەی پێ هەڵواسرابوون لێویان هەرهەمووی هەڵقلیشێنرابوو خوێنی لێ دەهاتە خوارێ سەر بەرەو خوار کرابوون و زمانیان دەبرد بۆ لستنەوەی قوڕاوێکی ڕەشی کەم لە بەردەمیاندابوو تالێی بخۆنەوە، ووتم ئەوانە کێن ؟ ووتی : ئەوانە کەسانێکن کە ڕۆژووەکانیان پێش کاتی ڕۆژوو شکاندن دەشکێنن . پاشان ڕۆیشتین تا گەیشتین بە پیاوان و ئافرەتانێك کە زۆر ئاوسابوون وە ڕوخسار وپۆشاکیان زۆر ناشرین بوو و بۆگەنیان وەك بۆنی زێراب پیس بوو، ووتم: ئەوانە کێن ؟ ووتی: ئەوانە زینا کارانن لە پیاوان وئافرەتان، پاشان بەڕێ کەوتین تا گەیشتین بە کۆمەڵێکی تر کە لەوانە زیاتر ئاوسابوون و بۆنیان ناخۆشتر بوو، ووتم: ئەی ئەوانە کێن ؟ ووتی : ئەوانە مردووانی کافرانن ،پاشان بەڕی کەوتین ولە دوورەوە دووکەڵێکی زۆرمان بینی وگوێمان لە هاوار و گریان بوو وە دەنگێکی زۆر گەورەمان گوێ لێ بوو ، ووتم ئەوە چی یە؟ ووتی: ئەوە لوورە لووری ئەهلی دۆزەخن سزا دەدرێن پاشان تێپەڕین بەلای پیاوانێکدا لە ژێر سێبەری درەختێکدا نووستبوون، ووتم: ئەوانە کێن ؟ ووتی : ئەوانە مردووانی موسوڵمانانن،پاشان ڕۆیشتین وتێپەڕین بەلای منداڵانێکی کوڕو کچی زۆر ، ومنداڵەکان یارییان دەکرد لە نێوان دوو ڕووباردا ، ووتم: ئەوانە کێن ؟ فەرمووی : ئەوانە جگەرگۆشەوکۆرپەی موسوڵمانانن کە بە منداڵی مردوون و ئیبراهیم (علیه السلام)لەوێ دایەنگاو سەرپەرشتیان دەکات . پاشان تێپەڕین بەلای پیاوانێکدا ڕوخساریان زۆر جوان بوو جل و پۆشاکی زۆر جوانیان لەبەردا بوو بۆنیان زۆر خۆش بوو دەم و چاویان وەکو پەڕەی سپی وابوو ، ووتم: ئەوانە کێن ؟ ووتی: ئەوانە ڕاست گۆیان

و پیاو چاکان و شەهیدەکانن ، پاشان ڕۆیشتین و ، تێپەڕین و بەلای سێ کەس دا دانیشتبوون شەرابی پاك و خاوێنیان دەخواردەوە و قسەی شیرینیاندەکرد، ووتم: ئەوانە کێن ؟ ووتی : ئەوانە: (زەیدی کوڕی حاریسە و ئیبن ورەواحە و جەعفەر)ن ، وویستم بچم بۆ لایان ، ووتی: بۆستە لە جێ ی خۆت پاشان بەرزکرامەوە بۆ شوێنێکی بەرزو سەرم بەرز کردەوە بینیم سێ کەس لە ژێر سێبەری عەرش دان شەرابیان دەنۆشی، ووتم: ئەوانە کێن؟ ووتی: ئەوە باوەگەورەتە ئیبراهیم و عیسا و موسایە چاوەڕێی تۆ دەکەن (علیهم السلام)[٣١٩].

## پێنجەم : سزادانی مردوو بەشین و واوەیلاکردن لەسەری:

چەندەها فەرموودە هاتووە لەبارەی سزادانی مردوو بە هۆی شین وشەپۆڕ واوەیلاکردن لەسەری لەوانە: -

**١ـ لە ( عومەری کوڕی خطـاب)** ەوە (رضي الله عنه) دەفەرمویت : پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : **((إن الميت يعذب ببعض بكاء أهله عليه..))** [٣٢٠]واتە: ئادەمیزادی مردوو سزا دەدرێت بە هەندێ لە شیوەن و گریانی کەس و کاری لە سەری .

**٢ـ** لە **(موغیرەی کوڕی شوعبە)** ەوە (رضي الله عنه) : پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : **((من نيح عليه فإنه يعذب بما نيح عليه يوم القيامة))** [٣٢١]واتە: هەرکەسێك شین و واوەیلا بکرێت لەسەری ، سزا دەدرێت (واتە مردووەکە) بەهۆی ئەو شین و واوەیلایەوە کە لەسەری کراوە لەڕۆژی قیامەتدا.

---

(٣١٩) أخرجه : النسائي في ((السنن الكبرى)) (٣٢٨٦) ، والطبراني في ((المعجم الكبير)) (٧٦٦٦-٧٦٦) واللفظ له، وابن الخزيمة في ((الصحيح)) (١٩٨٦) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٧٤٩١) وقال محققه إسناده صحيح ، والحاكم في ((المستدرك)) (٤٣٠/١) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي ، والبيهقي في ((السنن الكبرى)) (٢١٦/٤)، والحافظ في ((فتح الباري)) (٥٤٥/١٢): رواه الطبراني بإسناد جيد ، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) : (٧٦/١-٧٧) رواه الطبراني في ((المعجم الكبير)) ورجاله رجال الصحيح ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب والترهيب)) (٩٩٥)) ، و(( الصحيحة)) (٣٩٥١).

(٣٢٠) أخرجه : البخاري في ((الصحيح)) (١٢٨٧) ، والنسائي في ((السنن الكبرى)) (١٩٧٦) .

(٣٢١) أخرجه : البخاري في ((الصحيح)) (١٢٩١) ، ومسلم في ((الصحيح)) (٢١٥٤) ، واللفظ له، وأحمد في ((المسند)) (٧٢/٤) ، والبيهقي في ((السنن الكبرى)) (٢٤٥/٤) .

**٣ـ** له ( **عومەری کوڕی خطاب**)ەوە (رضي الله عنه): پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووبەتی: ((**المیت یعذب((فی قبره)) ببکاء الحی علیه))** [٣٢٢] واتە: مردوو سزا دەدرێت له گۆڕەکەیدا بەهۆی شین و هاوار و گریانی زیندوان لەسەری...

**٤ ـ** له (**عائیشه**) ەوه (رضي الله عنها) دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((**إن الله یزید الکافر عذابا ببعض بکاء الحی علیه** )) [٣٢٣] واته : خوای گەورە سزا لەسەر کافری مردوو زیاد دەکات لەبەر هەندێ گریانی زیندوان لەسەری. وە هەر له (عائیشه)ەوه (رضي الله عنها) دەفەرموێت : (پێغەمبەر (ﷺ) بەلای گۆڕی ئافرەتێکی جولەکەدا تێپەڕی کە خزمانی بە دیاریەوە دەگریان ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی...((**إنهم لیبکون علیها وإنها لتعذب فی قبرها....**)) [٣٢٤] واته: ئەوانه بەسەریەوە دەگرین ئەو گریانەش بۆی دەبێت بە سزا و سزای دەدرێت له گۆڕەکەیدا، کەواته لێرەدا مەبەستەکە تەنها شین و واوەیلاو لە خۆدان و نارەزاییبوون و ناسوپاس گوزاری خوایە، بەلاّم گریانێکی کەم بەبێ شین و واوەیلاو له خۆدان هیچ زیان و سزای نابێت بۆ مردووەکە .

پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێت : (( **إن الله لایعذب بدمع العین و لایحزن القلب و لکن یعذبُ بهذا وأشار إلی لسانه**)) [٣٢٥] واته:خوای گەورە سزای کەسێك نادات لەسەر غەمگینی دڵی یان فرمێسکی چاوی بەڵکو سزا دەدات لەسەر ئەمەو ((دەستی ڕاکێشا بۆ زمانی)) پێغەمبەر(ﷺ) له فەرموودەکەی پێشوودا دەفەرموێت (به هەندێ له گریانی زیندوانی لەسەر نەك هەموو گریانێك ، ئەو گریانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت له عومەرەوە (رضي الله عنه) : ((**المیت یُعذب فی قبره بالنیاحة علیه**)) [٣٢٦] واته: مردوو سزادەدرێت لە گۆڕەکەیدا بەشین و شەپۆڕ لەسەری . کەواتە جۆرە گریانێك شین و واوەیلای تیا بێت و بەدەنگی بەرزبێت ئەوە

---

(٣٢٢) أخرجه : البخاری في ((الصحیح)) (١٢٩٢) .

(٣٢٣) أخرجه : البخاری في ((الصحیح)) (١٢٨٦)، والشیخ الألباني في ((صحیح سنن النسائي)) (١٧٥٣).

(٣٢٤) أخرجه: البخاری في ((الصحیح)) (١٢٨٩) ، والنسائي في ((السنن)) (١٨/٤)، وصححه الشیخ الألباني في ((صحیح سنن النسائي)) (١٧٥١) .

(٣٢٥) أخرجه: البخاري (١٣٠٤).

(٣٢٦) أخرجه: النسائي في ((السنن)) (١٦/٤) ، وصححه الشیخ الألباني في ((صحیح سنن النسائي)) (١٧٤٩).

دەبێتەی هۆکاری سزادانی مردووەکە. زانایان سەبارەت بەم گریانە چەندین جۆر ووتەیان هەیە چونکە ڕوکەشی ئەم فەرموودە(صحيح) انە پێچەوانەیە بۆ ئایەتەکەی خوای گەورە کە دەفەرمویێت ﴿ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿٣٨﴾ ﴾ (النجم: ٣٨ ) (واتە : کەس گوناهی کەس هەڵناگرێت ) زانایان فەرمویانە واتای ئەم فەرموودە (صحيح)انەبەم جۆرە دەبێت :

**یەکەم :-** واتاکەی دەقاودەق وەك خۆی وایە، هەرکەس بگری لەسەر مردوویەك ئەوا مردووەکە سزا دەدرێت ئەمە بۆ چوونی عومەری کوڕی خەتابە(رضي الله عنه).

**دووەم :** - نەخێر بەهیچ جۆرێك ئەو مردووە بە گریان لەسەری سزا نادرێت .

**سێ یەم :** - کە دەفەرموێت (ببکاء) واتە: حاڵەتی گریانەکە...هەرکاتێ ئەوان بگرین لەسەرمردووەکە ئەو کاتە سزا دەدرێت ئەگەر نەگرین سزا نادرێت.

**چوارەم :-** ئەو سزایە تەنها تایبەتە بە کافرەکان ئەمەش بۆچوونی عائیشەیە(رضي الله عنها).

**پێنجەم :** - ئەو کەسانەی شین و واوەیلا دەکەن ، بە خوو بۆ دوای مردنیان و بە پێویستی دەزانن ، ئەمەش بۆچوونی بوخاریە.

**شەشەم :** - ئەو کەسانەن وەسیەتیان کردووە کە شین و واوەیلایان بۆ بکرێت لە دوای مردنیان .

**حەوتەم :** ـ ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە زانیویانە شین و واوەیلایان بۆ دەکرێت بەڵام وەسێتیان نەکردووە کە وانەکرێت لە سەریان .

**هەشتەم :** ـ ئەوانە دەگرێتەوە کە سزا دەدرێن بەهۆی ووتنی ئەو سیفاتانەی کە ئەو کەسانە لە کاتی شین و واوەیلاکەدا بە زمانیاندا دێت وەکو(شێرم ڕۆ، گەورە وسەروەرم ڕۆ، پشت و پەنام ڕۆ) .. بە هۆی ئەو قسانەوە سزا دەدرێت مردووەکە.

**نۆیەم :** ـ مەبەست لە سزادانی مردوو ناشرین کردن و سوکایەتی پێ کردنی فریشتەیە بۆ ئەو مردووە نەك سزادانی ، بەڵگەیان فەرموودەکەی (ئەبو موسا) یە (رضي الله عنه) کە دەفەرموێت : پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : (( **مامن میت یموت فتقوم نادبته:فتقول : ((واجبلاه،وا سنداه،وا عضداه،وا سیداه، وا ناصراه...)) أو شبهة ذلك إلا وكل به ملكان**

**يلهزانه:أهكذا كنت))**[٣٢٧] واتە: هەر مردووەیەك بمرێت و ئەوەی شینی بۆ دەكات لەسەری بڵێت : ئای لەو شاخەی لە كیسمان چوو ئای لەو سەروەرەی لە كیسمان چوو ئای لەو پشت و پەنایەی لە كیسمان چوو یان هاوشێوەی ئەوانە . دوو فریشتەكە لێی دەدەن ، ووشەی ((یلهزانه)) لە زمانەوانیدا بە واتای بۆكس پیاكێشان دێت یان بە واتای تووڕەبوون دێت دەفەرموێت : دوو فریشتەكە لێ ی دەدەن، و پێی دەڵێن : ئەوە تۆ وابووی گەورە و سەروەر و پشت وپەنا بووی ..هتد، وە هەروەها لە فەرمووده‌كەی تردا دەفەرموێت:((..**جبذ الميت وقيل له : أنت ناصرها أنت كاسيها**))[٣٢٨] واتە: مردووەكە ڕادەوەشێنن و پێی دەڵێن تۆ پشت و پەنای ئەوان بوویت تۆ سەروەری ئەوان بوویت ،وە ئیمامی عومەری كوڕی خەتابیش (رضي الله عنه) دەفەرموێت : " **إنَّه ليس مِنْ ميت يندبُ بما ليس فيه الا والملائكة تلعنه** "[٣٢٩] واتە : هەر مردوویەك وەصف بكرێت بە هەندێ صیفات كە تیایدا نەبوو بێت ئەو كەسە فریشتەكان نەفرینی لێ دەكەن.

دووەم بەڵگەشیان فەرموودەكەی (نوعمانی كوڕەی بەشیر) ە دەفەرموێت : (عبدالله جارێكیان نەخۆش كەوتبوو لە هۆش خۆی چوو خوشكەكەی لە لایەوە نزیك بوو ووتی : (وا جبلاه)..ئای لەو شاخەی لە دەستمان چوو هەندێ لەو قسانەی كرد و یاخود لەو سیفەتە چاكانەی باس كرد، عەبدوڵا كاتێ هۆشی هاتەوە خۆی بە خوشكەكەی ووت : هەر شتێكت پێ ووتم ، پێم دەووترا تۆ وا بوویت؟ تۆ ئەو پیاوە بوویت كەواباست كرا؟)[٣٣٠].

**دەیەم :** ـ بۆ لێكدانەوەی فەرموودەكە زانایان دەفەرموون مەبەست لە سزا دان سزادانی تۆڵەسەندنەوەنیە بەڵكو تەنها ناڕەحەتی و غەمگینی و خەفەتی مردووەكەیە بە گریانی خەڵكەكە لەسەری ، بەڵگەشیان بۆ ئەمە بۆ چوونەكەی (ئیبن و حەجەر)ە (رحمەالله) كە

(٣٢٧) أخرجه: الترمذي في((السنن)): (١٠٠٣)، وابن ماجة في ((السنن)) : (١٥٩٤) ، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)): (٨٠١)، وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) : (١٢٩٥)

(٣٢٨) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (٤/٤١٤)برقم (١٩٧١٦) وقال محققه : صحيح لغيره..

(٣٢٩) أخرجه أحمد بن منيع و الحارث بن اسامة في (مسنديهما ) باسنادٍ صحيح – كما قال البوصيري في (( إتحاف الخيرة)) برقم ( ٢٧٠٧).

(٣٣٠) أخرجه : البخاري في ((الصحيح)) (٤٢٦٧،٤٢٦٨).

دەفەرموێت: لە (فتح الباري) (٣/١٩٩) ئەمەش (بۆچوونی ئیمامی طبری)[٣٣١] یە لە سەر فەرموودەکەی (قیلەی کچی مەخرەمە) (رضي الله عنها) کە دوای ئەوەی کۆچی کرد بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) و موسوڵمان بوو پاشان باسی منداڵێکی خۆی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کرد کە لە منداڵیدا مردوە و ، دەستی کرد بە گریان کە باسی منداڵەکەی کرد ، پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاری کرد کە نەگری وە فەرمووی : ((... **فو الذي نفسي بيده ان احداكن لتبكي فتستعين له صويحبه ، فيا عباد الله لاتعذبوا موتاكم**)) واتە: سوێند بەوە گیانی منی بەدەستە ئەو کەسەی کە دەگری لەوکاتەدا هاوەڵ و دۆستەکەی (واتە : مردووەکە) بەهەمان شێوە دڵی غەمگین دەبێت وە خەفەت دەخوات پێی . دە کەواتە ئەی بەندەکانی خوا سزای مردووەکانتان مەدەن ...)[٣٣٢]

**شێخی ئەلبانی ( رحمه الله ) دەفەرموێت:** (زانایان بۆچوونیان جیاوازە لە واتای ئەم فەرموودەیەدا و هەموو قسەکانیان کۆدەبێتەوە .. لە دوو بۆ چووندا:

**یەکەم :**ـ بۆ چوونی جەماوەر ((واتە زانایان بە گشتی)): کە دەفەرموون: ئەو حەدیسە ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە وەسێتیان کردووە شین بکرێت بە سەریانەوە یاخود زانیویانە شین دەکرێت بە سەریانەوە بەڵام قەدەغەیان نەکردووە و وەسێتیان نەکردووە کە نەکرێت . وە سزا (**واتە :عذاب**) لای ئەوان بە واتای تۆڵە دێت (واتە/ **عقاب**) .

**دووەم :**ـ سزا دان واتای تۆڵە سەندنەوە نی یە بەڵکو بە واتای ناڕەحەتی و غەم و پەژارەی مردووەکەیە لە سەر ئەو شین و گریانەی کەس و کاری بۆی . وە تاقمی دووەم بۆ چوونیان وایە کە (**عذاب**) بەواتای (عقاب) نی یە بە هۆی ئەوەوە تۆڵەی لێبکرێتەوە نەخێر چوونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : ((**السفر قطعة من العذاب**))[٣٣٣] واتە : سەفەر پارچەیەکە لە

---

(٣٣١ ) کە (ابن المرابط) و (عیاض) و ئەوانەی شوێن کەوتووی ئەوانن بە (صحیح) یان داناوە . وە (ابن تیمیة) و کۆمەڵێك لە زانایانی سەردەمی تازە ئەم بۆچوونەیان سەر خستووە ، وە ئەمەش هەمان بۆچوونی ئیمامی سیوطي بڕوانە: ((تنویر الحوالك)) (١/٢٣٤) ، و ئیمامی عەجلۆنی بڕوانە :((کشف الخفاء)) ((١/٣٠١)) ، و صنعانی بڕوانە : ((سبل السلام)) ((٢/١٦٢)) .

(٣٣٢) أخرجه: الطبراني في ((المعجم الكبير)) (٢٥/١) ، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) : (٣/١٩٩) ، رواه الطبراني ورجاله ثقات ، وقال القرطبي في ((التذكرة)) (١/١٨٠): حديث معروف إسناده لابأس به .

(٣٣٣) أخرجه: البخاري (١٨٠٤).

سزا ، وە نەبێ ئادەمیزادی کۆچکار سزا بدرێت بەڵکو خۆی لە نارەحەتیدایە، پاشان ئەلبانی دەفەرموێت : (بۆچوونی یەکەم (راجح) ە واتە: چاکترە بەلامانەوە کە دەفەرموێت ئەو کەسانە دەگرێتەوە وەسیەتیان نەکردبێت کە شیوەنیان لەسەر نەکرێت یاخود وەسیەتیان کردبێت کە شیوەنیان لەسەر بکرێت)[٣٣٤].

**شەشەم : ئەو غەیبەت کارانەی کەسایەتی وڕێزی برایانی موسوڵمانی خۆیان لە کەدار دەکەن ( کە وەك ئەوە وایە گۆشتیان بخۆن ):**

ئەنەس (رضي الله عنه)دەفەرموێت : پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی **((لما عرج بی مررت بقوم لهم أظفار من نحاس يخمشون وجوههم وصدورهم))**..واتە کاتێك خوای گەورە بەرزی کردمەوە بۆ ئاسمان تێپەڕیم بە لای کەسانێکدا نینۆکەکانیان لە مس بوو دەم و چاو و سەرسنگی خۆیانیان پێ دەڕنی یەوە وبریندارى دەکرد . وتم: ئەوانە کێن ئەی جبریل **(علیه السلام)** ؟ فەرمووی : **((هؤلاء الذين يأكلون لحوم الناس ويقعون في أعراضهم...))**[٣٣٥] واتە : ئەوانە کەسانێکن گۆشتی خەڵکان دەخۆن (واتە غەیبەتیان دەکەن) و کەسایەتیان لەکەدار دەکەن و دەیان شکێنن لە ناو خەڵکدا ..

**حەوتەم: ئەو ووتار بێژە موسوڵمانانەی ئەوەی بە خەڵکی ڕادەگەیەنن خۆیان کردەوەی پێ ناکەن:**

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت :**((رأيت ليلة أسري بي رجال تقرض شفاههم بمقاريض من نار ، فقلت : من هؤلاء يا جبريل ؟ فقال: خطباء أمتك (من أهل الدنيا) كانوا يأمرون بالبر وينسون أنفسهم وهم يتلون الكتاب أفلا يعقلون))** واتە: (ئەو شەوەی بەرز کرامەوە بۆ ئاسمان پیاوانێکم بینی کە لێویان بە مەقاشی ئاگرین پارچە پارچە دەکرا و گۆشتیان لێ دەکرایەوە ووتم: ئەوانە کێن ئەی جبریل ؟ ووتی: ئەوانە ووتار بێژانی ئوممەتی تۆن لە دنیادا کەسانێك بوون

---

(٣٣٤) الشيخ الألباني في ((أحكام الجنائز)) ( ص: ٤١).

(٣٣٥) أخرجه أحمد : في ((المسند)) (٣/٢٢٤)برقم (١٢٢١١) وقال محققه : حديث صحيح ، و أبو داود في ((السنن)) (٤٨٧٨) ، و البيهقي في ((شعب الإيمان)) (٦٧١٦) ، وصححه الحافظ العراقي في ((الأحياء)) (٣/١٣٩)، وصحح أسناده أيضاً الشيخ الألباني في ((فقه السيرة)) (ص: ١٤٤) ،وفي((صحيح أبی داود)) (٤٠٨٢) ، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (٥٣٣)، وصححه أيضا الشيخ الأرناؤط في ((رياض الصالحين)) (٥٧٤).

کە فەرمانیان دەکرد بە چاکە بەڵام خۆیان ئەنجامیان نە ئەدا، و خۆیان لە بیر دەکرد خۆ ئەوان خۆێندەواربوون کتێبی خوایان دەخوێندەوە بۆ تێنە دەگەیشتن و ژیرانە کاریان پێ نەدەکرد ..) وفي رواية ((خطباء أمتك الذين يقولون ما لا يفعلون ويقرأون كتاب الله ولا يعملون به)) واتە: ((ئەوانە کەسانێکن ووتار بێژی ئوممەتی تۆن ئەوانەی کە بە خەڵکیان ڕادەگەیاند خۆیان ئەنجامیان نەئەدا و کتێبی خوایان دە خوێندەوە و جێ بە جێیان نەدەکرد و کاریان پێ نەدەکرد))(٣٣٦)

ئیبن و قەییم (رحمه الله) چەندین تاوانی تریش باس دەکات کە مردوو لە گۆڕەکەیدا سزا دەدرێت لەسەری وەك دەفەرموێت :(فعذاب القبر عن معاصي القلب والعين والأذن والفم واللسان والبطن والفرج واليد والرجل والبدن كله....) واتە: سزای گۆڕ بە هۆی سەرپێچی و تاوانی دڵ و چاو و گوێ و دەم و زمان و سك و داوێن و دەست و قاچ و هەموو ئەندامەکانی لەشە)

وەئیمامی (السفاريني ) دەفەرموێت :

"**هۆکارەکانی سزادانی گۆڕ دوو بەشە:-**

١- **هۆکارە گشتیەکان** : ئەوانەش سزا دەدرێن لەسەر نەناسینی خوا و پشت گوێ خستنی فەرمانەکانی و ئەنجامدانی سەرپێچیەکانی.

٢- **هۆکارە تایبەتیەکان** : ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی بەرپابوونی دوژمنایەتی لە نێوان خەڵکیدا لەرێ ی درۆ و بوختانەوە . وە لەوتاوانانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی ڕاگەیاندووین کە لەسەری سزا دەدرێن لە گۆڕەکانیاندا : خۆبەزل زان و دڵ ڕەق وبێ بەزەییەکان و ڕیابازەکان و ئەوانەی گاڵتەبەخەڵکی دەکەن و پلارهاوێژەکان و سوکایەتیکاران بەپێشینەکان (**السلف**) ، وە ئەوانەی کەدەچنە لای ئەستێرەگەران و جادوو گەران و فاڵچیەکان ،وپشتیوانانی

---

(٣٣٦) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (١٢٠/٣) ، و أبو نعيم في ((الحلية)) (٤٣/٨) ، والبيهقي في ((شعب الإيمان)) (٤٩٦٥-٤٩٦٧) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٥٣) . وقال محققة :حديث صحيح بمتابعاته ، وصححهُ الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٩١)، وفي ((صحيح الترغيب والترهيب)) (١٢١) وصححه الشيخ مقبل في ((الصحيح المسند)) (٨٤).

ستەم کاران و ئەوانەی کەسەر قاڵن بە کەم وکوڕی ونەنگی ولار وچەوتی خەڵکانەوە. ئا ئەوانە هەموو سزا دەدرێن لە گۆڕکانیاندا بەهۆی کەم و زۆری و گەورە وبچووکی ئەو تاوانانەوە"[٣٣٧]

پاشان با بزانین ئەو سزایە لە گۆڕدا بەتەنها لەسەر ڕۆحەکەیە یان لەسەر جەستەکەیە یان لەسەر هەردووکیانە بە یەکەوەیە ؟ ئەمەش خوای گەورە زاناترە پێ ی (والله أعلم) .

شیخ الإسلام (إبن تيمية) (رحمه الله) دەفەرمویێت : (سزاو خۆشی ناو گۆڕ لەسەر ڕۆح و جەستەیە ، جاری وا هەیە بە تەنها ڕۆحەکە خۆشی دەچێژێ یان سزا دەدرێت جاری واش هەیە کە ڕۆح و جەستە بەیەکەوە سزا دەدرێن یان خۆشی دەچێژن)[٣٣٨] ئەم سزادانەش جیاوازە بە پێ‌ی جیاوازی خەڵکان وەك ئەوەی کەسانێك بە چاوی خۆیان بینیویانە یان گوێیان لێ بووە(یان خوای گەورە وەك بیر خستنەوەیەك یان ووشیار کردنەوەیەك بۆ ئەو کەسانە) نیشانی داون و بەچاوەکانیان بینیویانە کەچۆن ئەو مردووانە سزا دراون بە چەندەها شێوە وەك : دەرپەڕینی پیاوێك لە گۆڕەکەی کە لەشی هەمووی بە ئاگرەوە بووە و زنجیرێك لە ملی دا بووە و پیاوێکی تریش ڕایکێشاوەتەوە بۆ ناو گۆڕەکەی و لێی داوە[٣٣٩] یان بینینی گۆڕێکی سەر هەڵدراوە لە لایەن یەکێکەوە کە ئێسك و کەللە سەری تیا بینیوە کە چەندەها بزماری دووسەری پیا داکوترابوو . وە بیستنی هەندێك کە نزیك بوون لە گۆڕێکەوە لە هاواری سزای مردووەکە . وەچەندەها بەڵگەی تریش[٣٤٠] .

ئەوانەی کفن دزبوون گەواهیان داوەکە هەندێك لەوانەی وویستویانە کفنەکانیان بدزن بە چاوی خۆیان بینیویانە ڕوویان وەرگێراوە لە قیبلە ، یاخود ئەوانەی بە ئاشکرا خوای گەورە داوێتی بە گوێیاندا لە هاوار و سزاو ناڵەی گۆڕ کە نزیك بووە لێیانەوە یان هەندێك کەس لەوانەی شتیان

---

(٣٣٧) ابن القيم في كتاب ((الروح)) (ص:٧٨) ( زیاتر لە (٨٠) تاوانی باس کردووە کە مردوو لەسەر سزا دەدرێت لە گۆڕدا)، وە بڕوانە : ((لوامع الأنوار البهية)) (١١٧/٢) .

(٣٣٨) انظر :كتاب (( الروح)) لابن قيم (ص: ٥١) ، وكتاب (( أهوال القبور )) (ص: ١٠٦) ، وكتاب (( لوامع النوار)) (٢٤/٢).

(٣٣٩) اخرجه : ابن ابي الدنيا في ((كتاب القبور)) برقم (٩٣) وقال محققه : حسن لشواهده ، وبرقم (١١٤) وقال محققه : اسناده حسن .

(٣٤٠) وە بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی ئەمەش سەیری کتاب ((الروح)) بکە ـ ابن القيم ـ لاپەڕە (٦٤ـ٦٨) ، وە کتێبی (أهوال القبور) ـ ابن رجب ـ لاپەڕە (٨٣ـ٩٥)، وە کتێبی (شرح الصدور) ـ السيوطي ـ لاپەڕە (١٧٣ـ١٨٠) .

لێ بەجێ ماوە لە گۆڕەکەداو ، گۆڕەکەیان هەڵداوەتەوە و بینیویانە چەندین مار لەسەر لاشەی مردووەکە بووە ، یاخود ئەوانەی کە مردوویان بینیوە سەرو دەست و قاچی هەمووی بەستراوە لە ئەڵقەیەکی تەوردا ....هتد..) .

ئیبن و قەییم ( رحمه الله) دەفەرموێت : (سزای گۆڕ دوو جۆرە ، جۆرێکیان بەردەوامە تا ڕۆژی قیامەت ئەویش بۆ کافرەکانە وە بۆ هەندێك لە چینە تاوانبارەکانە کە لە پێشدا باس کرا، دووەم بۆ ئەو تاوانکارانەیە کە موسوڵمان بوون وەماوەیەك سزای گۆڕ دەچێژن و پاشان لادەبرێت ، بەو شێوەیە پچڕ پچڕ دەبێت لەسەری یان ئەویش سزای هەندێ سەرپێچی کاری موسوڵمانانە بە ئەندازەی سەرپێچی یەکەی سزا دەدرێت پاشان لادەبرێت وە دە گونجێ بە دوعای برایانی موسوڵمانی خۆی یان قورئان خوێندن و ئیشێکی چاکەی منداڵێکی خۆی سزاکە لابچێت لە سەر یان یاخود ببێت بە خێر و چاکەکردن بۆیان ، وەیان بە پاداشتی حەج کردنێك خوای گەورە ئەو سزایە هەڵدەگرێت)[٣٤١]

# ئەو کردارانەی دەبێتە هۆی ڕزگار بوونی موسوڵمان لە سزای گۆڕ[٣٤٢]

پێغەمبەر(ﷺ) مژدەی داوەکە هەندێ لەو باوەڕدارانەی خوای گەورە ڕزگاریان دەکات لە سزای گۆڕ ئەمانەی خوارەوەن :

## یەکەم : شەهید بوون لە پێناوی خوادا

لە (میقدامی کوڕی مەعد) ەوە دەفەرموێت : پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : ((**للشهيد عند الله ست خصال ـ في رواية ـ [ سبع خصال ] يغفر له في أول دفعة من دمه ويرى مقعده من الجنة ويجار من عذاب القبر ويأمن من الفزع الأكبر...**))[٣٤٣]واتە: شەهید لای خوا حەوت

---

(٣٤١) أنظر : ((كتاب الروح)) لابن القيم (ص:٥١) ، وكتاب ((أهوال القبور)) (ص:١٠٧) وكتاب (لوامع الأنوار) (٢٤/٢) .

(٣٤٢) انظر : حول هذا الموضوع : ((لوامع الأنوار البهية)) (١٩/٢) .

(٣٤٣) أخرجه : الترمذي في (السنن): (١٦٣٣) وابن ماجة في (السنن) (٢٧٩٩)، وحسن إسناده الحافظ في (( فتح الباري)) (١٦/٦)،وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٣٥٨) وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) : (٢٢٥٧) وفي ((صحيح الجامع)) (٣٧٤٧) .

شتی بۆ هەیە ، بەیەکەم دلۆپ لە خوێنی کە دەڕژێت خوای گەورە لـە هـەموو گوناهی خۆش دەبێت ، وە شوێنی خۆی لە بەهەشت دا نیشان دەدات وە پارێزراو دەبێت لە سزای گۆڕ ...هتد .. واتە : هەموو جۆرە سزایەکی ناوگۆڕی لیّ دوورە، لەفەرموودەکەی تردا (راشدی کوڕی سەعد) ، دەفەرموێت : هاوەڵێکی پێغەمبەر (ﷺ) بە پێغەمبەری ووت : **((ما بال المؤمنين يفتنون في قبورهم إلاّ الشهيد ؟ قال ((كفى ببارقة السيوف على رأسه فتنة))**(٣٤٤). واتە : بۆچی باوەڕداران توشی تاقیکردنەوە دەبن لە گۆڕەکانیاندا تەنها شەهید نەبێت ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (شەوقی شمشێر بە سەریانەوە بەسە بۆ تاقی کردنەوەیان) ، ئیبن و قەیم ـ رحمه الله ـ دەفەرموێت : (واتای ئەو فەرموودەیەی پێشوو (والله أعلم) ئەوەیە : خوای گەورە ئەو شەهیدە تاقی دەکاتەوە و جیای دەکاتەوە لە دووڕووەکان بە شەوق و بریسکەی سەری ئەو شمشێرەی کە پێ ی شەهید بووە و ڕای نەکردووە لەبەردەمیدا . وە ئەگەر دووڕوو بوایە ئەوا ئارامی نەدەگرت و ڕای دەکرد و ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی باوەڕەکەی وای لیّ کردووە ئارام بگرێت و ڕۆحی خۆی ببەخشێت لە پێناوی خوادا)(٣٤٥) .

## دووەم : مردن لە ڕۆژی هەینی دا یان لە شەوەکەیدا

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : **(( إنَّ يوم الجمعة سيِّد الايام ، وأعظمها عند الله ، وهو اعظم عند الله من يوم الأضحى و يوم الفطر ...))**(٣٤٦) واتە : ڕۆژی جومعە سەروەری ڕۆژەکانە ولە هەموویان گەورەتر لای خوا ، ئەو ڕۆژە گەورەترە لای خوا لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان .

وە لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: **(( خير يوم طلعت عليه الشمس يوم الجمعة ، فيه خلق آدم [ وفيه أدخل الجنة وفيه أخرج منها ] [ وفيه مات وفيه تيبَ عليه][ وفيه النفخة**

---

(٣٤٤) أخرجه : النسائي في((السنن)) (٩٩/٤) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (١٩٤٠) ، وفي ((أحكام الجنائز )) (ص: ٥٠)

(٣٤٥) انظر : في كتاب ((الروح)) لابن القيم (ص: ٨١) بـۆ زیاتر ڕوون کردنـەوە سـەیری (حاشية السندى على سنن النسائي) بکە (٩٩/٤-١٠٠). .

(٣٤٦) اخرجه : أحمد (٤٣٠/٣) ، وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع ) (٢٢٧٩) ، و(صحيح الترغيب) (٦٩٥).

وفيه الصعقة] ...))[٣٤٧] واته : چاكترين ڕۆژێك ڕۆژی بەسەردا هەڵ هاتبێت ، ڕۆژی جومعەیە، لەو ڕۆژەدا ئادم ( عليه السلام) دروست كرا ، وە لەو ڕۆژەدا كراواتە نـاو بەهەشـتەوە ، وە لـەو ڕۆژەدا دەركراوە لە بەهەشت ، وەلەو ڕۆژەدا تەوبەی لێ وەرگـیراوە ، وەلـەو ڕۆژەشـدا وەفـاتی كردووە ،وەهەر لەو ڕۆژەدا ڕۆژی كۆتایی دێتە پێش ]..

لە عبدالله ی كوڕی عەمرەوە (رضي الله عنه) دەفـەرموێت پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) فـەرمووی : ((ما من مسلم يموت يوم الجمعة أو ليلـة الجمعـة إلا وقـاه الله مـن فتنـة القـبر ))[٣٤٨]. واتـه : هـەر موسوڵمانێك لە ڕۆژی جومعەدا یان لە شەوەكەیدا بمرێت خوای گـەورە لـە تاقیكردنـەوەی گـۆڕ دەیپارێزێت .

## سێ یەم : پاساوانی كردن لە پێناوی خوادا ( الرباط )

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی :((كل ميت يختم على عمله الا الذى مات مرابطاً في سبيل الله فإنـه ينمـو لـه عملـه إلى يـوم القيامـة ويـأمن مـن فتنـة القبر))[٣٤٩] . واته : (هەموو مردوویەك كۆتایی بە كردەوەكانی دێت و مۆر دەنرێـت بەسـەریدا تەنها ئەو كەسە نەبێت كە لە پێناوی خوای گەورەدا پاسەوانی كردووە دژ بەدوژمنانی كافر ئەو كەسە كردەوەكەی گەشەی پێ دەدرێت لە گۆڕدا تا ڕۆژی كۆتایی و پـارێزراو دەبێـت لـە سـزاو تاقیكردنەوەی گۆڕ) .

---

(٣٤٧) أخرجه: أحمد (٥٠٤/٢) ، ومسلم (٨٥٤)، وأبوداود (١٠٤٦، ١٠٤٧) ، والترمذي (٤٩١)، والحاكم (٢٧٨/١) وصححه على شرطهما ووافقع الذهبي ، وابن حبان (٢٧٧٢) ، وصححه الشيخ الألبـاني في (صـحيح أبـي داود ) (٩٦١ ،١٠٢٤)، و(صحيح الجامع) (٣٣٣٤).

(٣٤٨) أخرجه : عبدالرزاق في ((المصنف)) (٥٥٩٦) ، وأحمد في ((المسند)) (١٦٩/٢) ، والترمذى في ((السنن)) (١٠٧٤) ، والطحاوي في ((مشكل الاثار)) (ص : ١٠٨)، وصححه الشيخ الألباني لمجموع طرقه في ((أحكام الجنائز)) (ص : ٥٠) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٥٧٧٣) ، وفي ((صحيح سنن الترمذى)) (٨٥٨) ، وفي ((المشكاة)) (١٣٦٧) .

(٣٤٩) أخرجه : مسلم في ((الـصحيح)) : (٤٩١٥) ، وأحمـد في ((المـسند)) (٢٠/٦) ، والنـسائي في ((الـسنن)) (٣٩/٦) ، الترمذى في ((السنن)) (١٦٢١) والطبراني في ((المعجم الكبير)) (٨٠٢/١٨) والحاكم في ((المستدرك)) (١٤٤/٢) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبى وابن حبان في ((الـصحيح)) (٤٦٢٤) وقـال محققـه : إسـناده صـحيح : وصـححه الـشيخ الألبـاني في ((السلسلة الـصحيحة)) (٥٤٩) ، وفي ((المـشكاة)) (٣٤)، وفي ((صـحيح سـنن الترمـذى)) (١٣٢٢) ، وفي ((صحيح سنن أبي داود)) (١٢٥٨)

وه‌هه‌روه‌ها پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌فه‌رموێت :(( من مات مرابطاً في سبيل الله اجري عليه عمله الصالح الذي كان يعمل [(وفي رواية ) اجرى الله له اجره الذي كان يعمل : اجر صلاته وصيامه و نفقتِهِ]، واجري عليه رزقه ، وأمِن من الفتان ، وبعثه الله آمنا من الفزع الكبر ))[٣٥٠] . واته : هه‌ر كه‌سێك بمرێت له كاتی پاسه‌وانی كردندا له پێناوی خوای گه‌وره ، خوا ئه‌و كرده‌وه چاكه‌ی بۆ درێژه پێده‌دات [ پاداشتی ئه‌و كاره‌ی كه ئه‌نجامی داوه : پاداشتی نوێژ و ڕۆژو وه‌خه‌رجیه‌كانی ] ، وه درێژ به ڕۆزی پێدانی بۆ ده‌درێت تا ڕۆژی كۆتایی وه دوور ده‌بێت له تاقیكردنه‌وه و لێ پرسینه‌وه‌ی ناوگۆڕ ، وه له ڕۆژی كۆتایشدا خوای گه‌وره زیندوی ده‌كاته‌وه و بێ ترسی ده‌كات له تۆقینی هه‌ره‌گه‌وره.

## چواره‌م : خوێندنی سوره‌تی ( الملك )

پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ده‌فه‌رموێت : ((سورة تبارك هي المانعة من عذاب القبر ...))[٣٥١] . واته: (سوره‌تی ته‌باره‌ك ئه‌و سوره‌ته‌یه‌كه ڕێگره له سزای گۆڕ ) واته: ئه‌و موسوڵمانانه‌ی كه بیخوێنن یان له‌به‌ریانه هیوا وایه كه (إنشاء الله) خوای گه‌وره بیان پارێزێت له سزای گۆڕ . پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ده‌فه‌رموێت : (( إن سورة في القرآن ثلاثون أية شفعت لصاحبها حتى غُفِر له ﴿تبارك الذي بيده الملك﴾ ))[٣٥٢]

واته: سوره‌تێك له قورئاندا هه‌یه سی ئایه‌ته تكای بۆ خاوه‌نه‌كه‌ی كرد تا خوا لێ ی خۆش بوو . خوێندنه‌كه‌شی ـ والله أعلم ـ چاكتر وایه پێش خه‌وتن بێت.

له ڕیوایه‌تێكدا ده‌فه‌رموێت : ((كان لاينام حتى يقرأ (السجدة) ، و(تبارك) ،[ وبني اسرائيل) و (الزمر)]))[٣٥٣].واته: هه‌موو شه‌وێك پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) پێش ئه‌وه‌ی بخه‌وێت چوار

(٣٥٠) أخرجه :الطبراني (الكبير)( ٦١٧٩) ، واحمد (٢٣٧٢٧) وقال محققه : حديث صحيح، وابن ماجة في ((السنن)) (٢٧٦٧) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٢٢٣٤) .

(٣٥١) أخرجه: الحاكم في ((المستدرك)) (٤٩٨/٢) وصححه ووافقه الذهبى ، والبيهقي في ((شعب الايمان)) (٢٥١٠)، وأبو الشيخ في ((طبقات الأصفهانيين)) (٢٦٤) ،وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٣٦٤٣) ، وفي ((السلسلة الصحيحة)) (١١٤٠) .

(٣٥٢) أخرجه : أبوداود (١٤٠٠)، والترمذي (٢٨٩١)، وابن ماجة (٣٧٨٦) ،وصححه الشيخ الألباني في (صحيح ابي داود) (١٢٤٧).

(٣٥٣) أخرجه : الترمذي (٣٤٠٤، ٣٤٠٥) ، وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٦٤١ ،٥٨٧).

سورەتی خوێندووە یەکێ لەو سورەتانە سورەتی تەبارەك بووە، پاشان سورِەتی(السجدة ) ، و پاشان (الاسراء ) ،و پاشان (الزمر ). بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : پارێزراوە لە سزای گۆڕ وە هەروەها دەور کردنەوەو خوێندنەوەی دەبێتەوە هۆی ئەوەی کە دێتە وەڵام لەسەر خاوەنەکی و دووری دەخات لە سزای گۆڕ.وە لە ڕوایەتێکدا هاتووە :(( من قرأها كل ليلة جاءت تجادلُ عن صاحبها)) (٣٥٤) واتە: ((هەرکەسێك هەموو شەوێك بیخوێنێتەوە ، دێت و خاوەنەکەی سەر دەخات وتکای بۆ دەکات)).

## پێنجەم : مردن بە نەخۆشی سك چوون

لە (سولەیمان بن صرد و خالید بن عرفطة) و (رضي الله عنهما) ... پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی : ... ((من يقتله بطنه فلن يعذب في قبره ...))(٣٥٥). واتە: هەرکەسێك سکی بیکوژێت یاخود ببێتە هۆی مردنی و لەناوچوونی بە هیچ جۆرێك سزا نادرێت لە گۆڕدا. دیارە ئەوەش کە ئیمامی (سندی) دەفەرموێت ئەم (بطن) ە مەبەست لە(إستسقاء) واتە: ووشك بوونەوەی ناو سك کە بە هۆی سك چوونەوە دەبێت (والله أعلم).

## شەشەم : خێر وچاکە کردن

خێر وچاکە کردن گوناه دەکوژێنێتەوە ، وەك چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە ،خێر و(صدقە)ی نهێنی تورە بوونی خوا ناهێڵێت بەسەر خاوەنەکەیەوە. وەلە گۆڕیشدا سزاو گەرمایی لەسەر خاوەنەکەی دەکوژێنێتەوە: عوقبەی کوڕی عامر (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەروە (ﷺ) کە

---

(٣٥٤) أخرجه: الدارمي ((٢/٤٥٥)) ، والبيهقي في : ((اثبات عذاب القبر)) (١٦٣) .

(٣٥٥) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (٥/٢٩٢) رقم (١٨٣١٠) وقال محققه الشيخ الأرناؤط إسناده صحيح ، والنسائي في ((السنن)) (٤/٩٨) ، وفي ((السنن الكبرى)) (٢١٩٧) ، والترمذي في ((السنن)) (١٠٧٠) ، وأبو يعلى في ((المسند)) (٣١٨)، والطبراني في ((المعجم الكبير)) (٤١٠١) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٢٩٣٣) ، والبيهقي في ((الشعب)) (٩٨٨٣) ، وصحح إسناده الحافظ في ((الإصابة في تميز الصحابة)) (٢/٢٤٤) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (١٩٣٩) ، وفي ((صحيح سنن الترمذي)) (٨٤٩) ، وصححه أيضاً الشيخ مقبل في ((الصحيح المسند)) (٤٥٤)

فەرموویەتی:((إنَّ الصدقة لتطفيء عن أهلها حرَّ القبور..))[٣٥٦] واتە : خێر وچاکەکردن گەرماوگڕی ناو گۆڕەکان دەکوژێنێتەوە بەسەر خاوەنەکانیانەوە.

# ئەوەی کە مردووی باوەڕدار سوودی لێ وەردەگرێت لە گۆڕدا

## یەکەم : نوێژکردن لەسەر جەنازە و دوعاکردن بۆ مردووەکە :

ئەگەر کۆمەڵێکی موسوڵمان ـ بێ گومان تا ژمارەیان زۆر تر بێت چاکترە ـ کۆ ببنەوەو نوێژی مردوو لەسەر جەنازەیەك بکەن و دوعای خێری بۆ بکەن و داوای لێخۆش بوونی بۆ بکەن لای خوای گەورە ، ئەوا ئەو مردووە سوودێکی چاکی پێ دەگات ، وەکو لەم ریوایەتەدا هاتووە لە عائیشەوە (رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی : **((ما من ميت يصلي عليه أمة من المسلمين يبلغوا أن يكونوا مائة فيشفعون له إلآ شُفّعوا فيه...))**[٣٥٧] واتە : هەر موسوڵمانێك بمرێت و کۆمەڵێك موسوڵمانان کۆ ببنەوە کە ژمارەیان بگاتە سەد کەس و تکای بۆ بکەن لای خوا بێ گومان خوای گەورە تکاکەیان لێ وەردەگرێت .

وە لە ڕوایەتێکدا لە(ئیبن و عەباسە)وە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی :

**((ما من مسلم يموت فيقوم على جنازته أربعون رجلا لا يشركون بالله شيئا إلآ شفعوا فيه))**[٣٥٨] .واتە: هەر موسوڵمانێك بمرێت و چل پیاو لەو موسوڵمانانەی کە بە هیچ جۆرێك هاوبەش بۆ خوا بڕیار نادەن تکا و دوعا بکەن بۆ ئەو مردووە خوای گەورە تکاکەیان وەردەگرێت و لێ ی خۆش دەبێت . لە ڕیوایەتێکی تردا: **((... فإن صلاتكم على موتاكم تنور لهم في قبورهم ...))**[٣٥٩] واتە : نوێژ کردنتان لەسەر مردووەکانتان گۆڕەکانیان بۆ ڕووناك دەکاتەوە .

---

(٣٥٦) أخرجه : الطبراني ((الكبير)) (١٧/ ٢٤٨ (٧٨٨) ) ، والبيهقي ((الشعب)) (٣٣٤٧) ، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب و الترهيب )) برقم (٨٧٣).

(٣٥٧) أخرجه : مسلم في ((الصحيح)) (٢١٩٥) ، والنسائي في ((السنن الكبرى)) (٢١١٨) ،وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (١٨٨١).

(٣٥٨) أخرجه أبو داود في ((السنن)) (٣١٧٠) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن أبي داود)) (٢٧١٤).

(٣٥٩) أخرجه: البيهقي في ((السنن الكبرى)) (٤/٤٨) ، وحسن إسناده الحافظ في ((فتح الباري)) (١/٥٥٣) .

## دووەم :شایەتی بۆدان و باسکردنی مردووکە بەچاکە لەلایەن خەڵکی یەوە:

لە (**عومەری کوڕی خطاب**)ەوە (رضي الله عنه) پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی : ((**...أيما مسلم شهد له أربعة بخير إلا أدخلَهُ الله الجنة**)) ... واتە هەر موسوڵمانێك چوار موسوڵمان شاهێدی بۆ بدەن کە چاکە خوای گەورە دەیخاتە بە هەشتەوە ... ((**قال : قلنا وثلاثة ؟ قال ((ثلاثة)) قال: قلنا وإثنان ؟ قال ((إثنان)) ولم نسأله عن الواحد**))(٣٦٠) واتە: ووتمان سێ کەس ؟ فەرمووی : سێ کەسیش وە پاشان ووتمان : ئەی دوو کەس ؟ فەرمووی: دوو کەسیش بەڵام پرسیاری یەك کەسمان لێ نەکرد . لە ریوایەتەکەی (ئەنەس) (رضي الله عنه) لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : ((**مامن مسلم يموت ويشهد له أربعة أهل ابيات من جيرانه الأدنيين أنهم لا يعلمون منه إلآ خيرا ...إلاّ قال الله تبارك وتعالى قد قبلت قولكم أو قال ـ بشهادتكم ـ وغفرت له مالا تعلمون**))(٣٦١) واتە : هەر موسوڵمانێك بمرێت و چوار کەس لە دراوسێکانی نزیکی شاهێدی بۆ بدەن کە تەنها خێر و چاکە نەبێت هیچی تریان لێ نە بینیوە خوای گەورە قسەی ئەو چوار دراوسێ نزیکە وەردەگرێت و دەفەرموێت : ئەوا شایەتی ئێوەم بۆ قبوڵ کرد و لەو گوناهانەی کە هەیەتی و ئێوە پێ ی نازانن لە هەر هەمووی خۆش بووم . بۆیە جارێك جەنازەیەك تێپەڕی بەلای هاوەڵە بەرێزەکاندا بە چاکە باسیان کرد و، وە جەنازەیەکی تر بەلایاندا تێپەڕی بەڵام ئەمەیان بە خراپە باسیان کرد، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە هەردوو حاڵەتەکەدا فەرمووی: (هاتە دی، ئەوەی ئێوە باستان کرد بە چاکە بەهەشتی بۆ مسۆگەر بوو ، وە ئەوەی بە خراپەش باستان کرد دۆزەخی بۆ مسۆگەر بوو ... فریشتەکان شاهیدانی خوان لە ئاسماندا وە ئێوەش شاهیدانی خوان لەسەر زەویدا ((**الملائكة شهداء الله في السماء وأنتم شهداء الله في الارض**)) .

---

(٣٦٠) أخرجه: البخاري في ((الصحيح)) (٢٦٤٣) ، والنسائي في ((السنن)) (٥٠/٤) ، والترمذي في ((السنن)) (١٠٥٩) ، والبيهقي في ((السنن الكبرى)) (٧٥/٤) ، وأحمد في ((المسند)) (٣٠/١) ، و ابن حبان في ((الصحيح)) (٣٠٢٨) وقال محققه : إسناده صحيح .

(٣٦١) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (٢٤٢/٢) ، والحاكم في ((المستدرك)) (٣٧٨/١) و صححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي ، وابن حبان في ((الصحيح))(٣٠٢٦) و قال محققه: حديث صحيح بشواهده ، ولذلك قالت عالت عائيشة (رضي الله عنها) : (( لاتذكروا هلكاكم الاّ بخير)). أخرجه: هناد في ((الزهد)) (١١٦٤) وقال محققه:اسناده صحيح.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا ((والمؤمنون شهداء الله فى الأرض))[٣٦٢] .واتە : خاوەن باوەڕان شاهیدانی خوان لەسەر زەویدا ، وە شایەتیدانی موسوڵمانانیش هەر لە خۆیانەوە نیە بەڵکو بەهۆی ئەو فریشتانەوەیە کە لەسەر زمانی ئەو موسوڵمانانە شایەتیان بۆ ددەن و باسیان دەکەن بەچاکە، وەکو لەم فەرموودەیەدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : ((ان لله ملائكة تنطق على ألسنة بني آدم بما في المرء من الخير والشر ...)) [٣٦٣] . واتە : خوای گەورەچەند فریشتەیەکی هەیە کە قسە دەکەن و شایەتی دەدەن لەسەر زمانی خەڵکان بەرامبەر کەسێك بە چاك بێت یان بەخراپ ،مەبەست لە (بنى أدم) شایەتی چینی هاوەڵان و پیاوچاکان و ڕاستگۆو لە خواترسانە نەوەك شایەتی فاسق و دووڕوو بیٚ بڕوا.

### سیٚ یەم : دوعای موسوڵمان بۆ مردووەکە :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَالَّذِينَ جَاءُو مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾ (الحشر: ١٠)[٣٦٤]
واتە: ئەوانەی کە دوای چینە بەڕێزەکانی (صحابە) دێن داوا لە خوای گەورە دەکەن و دەڵێن : خوایە لە ئێمەو ئەو برا موسوڵمانانە خۆش ببە کە لە پێش ئێمەوە بە ئیمانەوە ڕۆیشتون ، واتە مردون ، کەوا بوو ئەگەر سودی نەبوایە خوای گەورە باسی نەدەکرد لە قورئاندا ، وە بەبەڵگەی فەرموودەکەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە دەفەرموێت :

---

(٣٦٢) أخرجه : البخاري في ((الصحيح)) (٣٦٧) ، ومسلم في ((الصحيح)) (٩٤٩) ، والنسائي في ((السنن))(٢٧٣/١)، وأحمد في ((المسند)) (١٧٩/٣ ـ ٢١١) ، و الترمذي في ((السنن)) (١٠٥٨) ، وابن ماجة في ((السنن)) (١٤٩٢) ، وأنظر: ((أحكام الجنائز)) للشيخ الألباني (ص:٦٠) ، وفي ((صحيح سنن النسائي)) (١٨٢٤) .

(٣٦٣) أخرجه : الحاكم في ((المستدرك)) (٣٧٨/١) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي ، والبيهقي في ((شعب الايمان)) (٩٣١٨) ، والديلمي في ((فردوس الأخبار)) برقم (٦٨٤) ، وابن عدي في ((الكامل)) (٢٦١/٧) ، وأورده البخاري في ((المقاصد الحسنة)) (١٢٤) ، والسيوطي في ((الأحاديث المشتهرة)) (١٢٤) ، والعجلوني في ((كشف الخفاء)) (٧٧٩)، وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٢١٧٥) ، و (الصحيحة) (١٦٩٤).

(٣٦٤) أنظر :حول الموضوع ((الأذكار)) للنووي (ص: ٢٤١) .

((دعوة المرء المسلم لأخيه بظهر الغيب مستجابه عند رأسه ملك موكل كلما دعا لأخيه بخير قال الملك الموكل به : آمين ولك بمثل)) (٣٦٥) . واته : دوعای كه‌سێكی موسوڵمان بۆ برای موسوڵمانی خۆی به نهێنی (واته بێ ئه‌وه‌ی پێی بزانێ) گیرایه هه‌ر كاتێ ئه‌و موسوڵمانه دوعا بكات بۆ براكه‌ی فریشته‌یه‌ك لای سه‌ریه‌وه وه‌ستاوه كه ئیشی گه‌یاندنی ئه‌و دوعایه‌یه بۆ ئه‌و موسوڵمانه‌و وه‌ڵامدانه‌وه‌ی ئه‌و كه‌سه‌یه ـ واته چینێك له چینه‌كانی فریشته ته‌نها ئه‌و ئیشه‌یان هه‌یه ـ هه‌ركاتێ دوعا بكات بۆ برا موسوڵمانه‌كه‌ی ئه‌و فریشته‌یه وه‌ستاوه لای سه‌ریه‌وه‌و (ئامین) ده‌كات ، واته : داوای قبوڵ بوونی دوعاكه‌شده‌كات: بۆ خودی ئه‌و دوعاكاره و دوعاكه ده‌گه‌یه‌نێت به مردووه‌كه‌و به ئه‌و برا موسوڵمانه‌ش ده‌ڵێ : چی دوعای خێرت بۆ ئه‌و مردووه كردووه ئه‌و دوعایه بۆ تۆشه ، ئه‌و دوعا كردنه مه‌به‌ستی پێی دووكاته

ـ یه‌كه‌میان : كاتی نوێژی جه‌نازه‌كه، دووهه‌میان : كاتی ناشتنی مردووه‌كه . وه‌ك له‌م فه‌رموودانه‌دادیاره : پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ده‌فه‌رمووێت : ((اذا صليتم على الميت فأخلصُوا لهُ الدعاء)) (٣٦٦). واته : گه‌ر نوێژتان كرد له سه‌ر مردوویه‌ك زۆر به دڵسۆزانه دوعای بۆ بكه‌ن ، وه هه‌روه‌ها له ڕیوایه‌تێكی تردا له (عثمان)ه‌وه (رضي الله عنه) ده‌فه‌رموێت : هه‌ركاتێ پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) له ناشتنی مردوویه‌ك ته‌واو بوایه ده‌یفه‌رموو .. ((استغفروا لاخيكم وسلوا له التثبيت فانه الأن يسأل ...))(٣٦٧) . واته : داوای لێ خۆش بوون بۆ ئه‌م برایه‌تان بكه‌ن وه‌داوای بۆ بكه‌ن تا وه‌ڵامی دوو فریشته‌كه بداته‌وه چونكه ئه‌و ئێستا پرسیاری لێ ده‌كرێت . كه‌واته ئه‌و مردووه زۆر زۆر سودی لێ ده‌بینێت و دوعای زیندوانی پێ ده‌گات بۆ گۆڕه‌كه‌ی وه له‌وانه‌یه سزا كه‌م بكرێته‌وه یان لاببرێت له‌سه‌ری ـ والله اعلم ـ وه ئه‌و موسوڵمانه‌ی دوعا بكات بۆ برایه‌كی تری

---

(٣٦٥) أخرجه : مسلم في ((الصحيح)) (٢٧٣٣) ، واحمد في ((المسند)) (٦/٤٥٢) .

(٣٦٦) أخرجه : ابو داود في ((السنن)) (٣١٩٩) ، وابن حبان في ((السنن)) (١٤٩٧) ، والبيهقي في ((السنن الكبرى)) (٤/٤٠) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣٠٧٦) وقال محققه اسناده قوي ، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابي داود)) (٢٧٤٠) ، وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) (١٢١٦) ، وفي ((الارواء الغليل)) (٧٣٢) ، وفي ((المشكاة)) (١٦٤٧).

(٣٦٧) أخرجه: أبي داود في ((السنن)) (٣٢٢١) ، والحاكم في ((المستدرك)) (١/٣٧٠) وصححه ووافقه الذهبي والبيهقي في ((السنن الكبرى)) (٤/٥٦) ، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن أبي داود)) (٢٧٥٨) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٩٤٥) ، وفي ((أحكام الجنائز))(ص:١٩٨) .

موسولمانی ئەوا پلە بەرزی و سەربەرزیەکی زۆر بۆ خۆی بەدەست دێنێ لە ژیاندا وەکو پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: ((من استغفر للمؤمنين والمؤمنات كتب الله له لكل مؤمن ومؤمنة حسنة))[٣٦٨] . واتە : هەرکەسێك داوای لێ خۆش بوون بکات بۆ خوشك و برایانی بڕواداری ئەوا بە ژمارەی هەموو بڕواداریکی براو وخوشکی چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت . واتە بڵێ ((اللهم اغفر للمؤمنين والمؤمنات والمسلمين والمسلمات)) .

## چوارم : قەرزدانەوە بۆ مردووەکە :

لەو شتانەی تر کە موسوڵمان سودی لێ وەردەگرێت لە گۆڕەکەیدا بۆ دانەوەی قەرزە کانیەتی لەلایەن زیندووەکانەوە: پێغەمبەر(ﷺ) بۆی ڕوون کردوینەتەوە هەموو موسوڵمانێك ڕۆحەکەی بەند دەکرێت ئەگەر قەرزار بێت هەتاوەکو بۆی دەدرێتەوە ، ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەفەرموێت : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((نفس المؤمن معلقة ماكان عليه دين [ حتى يقضى عنه]))[٣٦٩] . واتە : ڕۆحی خاوەن باوەڕ بەندە بەقەرزەکەیەوە ، ڕاوەستاوە تابۆی دەدرێتەوە کە قەرزەکەیان بۆ دایەوە پاشان ئازاد دەکرێت ، ڕۆحی خاوەن باوەڕ ئەگەر ئەهلی بەهەشتیش بێت ناچێتە بەهەشت تا قەرزەکەی بۆ نەدرێتەوە .. .

لە سەمرەی کوڕی جوندوبەوە (رضي الله عنه) دەفەرموێت : ( پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێکیان بەرەو ڕومان هات و فەرمووی : کێ لێرەیە لە بەنی فلان خزمێك یان ناسیاوێك ؟ دەفەرموێت هاوەڵە بەڕێزەکان بێدەنگ بوون عادەتیان وا بوو هەر کە پرسیارێکیان لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) لێ بکرایە بێ دەنگ دەبوون دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) دووبارەی کردەوە پاشان یەکێك لە هاوەڵەکان ووتی: ئائەمە یەکێکە لە خزمانی ئەو ، پێغەمبەر (ﷺ) بەیەکێ لە خزمەکانی

---

(٣٦٨) أخرجه: الطبراني في ((المعجم الكبير)) ، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (١٠/ ١٧٥٩٧) اسناده جيد ، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح الجامع)) (٥٩٠٢) .

(٣٦٩) أخرجه: أحمد في ((المسند)) (٢/٤٤٠) ، والترمذي في ((السنن)) (١٠٧٩) ،وابن ماجة في ((السنن)) (٢٤١٣)، والدارمي في ((السنن)) : (٢/٢٦٢) ، والطيالسي في ((المسند)) (٢٣٩٠) ، والحاكم في ((المستدرك)) (٢/٢٧) و صححه على شرطها ووافقه الذهبي واللفظ له والبيهقي في ((السنن الكبرى)) (٦/٧٦) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٣٠٦١) وقال محققه اسناده صحيح على شرطها ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (٨٦٠) ، وفي ((صحيح سنن ابن ماجة)) (١٩٥٧) .

فه‌رموو : ((إنَّ صاحبكم قد حُبس على باب الجنة بدَينٍ كان عليه ...))[٣٧٠] . واته : هـاوڕێ مردووه‌كه‌تان كه مرد به‌ند كراوه له به‌رده‌م ده‌رگای به‌هه‌شت دا له‌سه‌ر قه‌رزێك كه هێشتا بـۆی نه‌دراوه‌ته‌وه .كه‌واته خاوه‌ن باوه‌ڕ ئه‌گه‌ر ئه‌و قه‌رزه‌ی كه له سه‌رێتی بۆی بدرێته‌وه ئه‌وا سزاكه‌ی له‌سه‌ر لاده‌برێت ،سه‌موره‌ر (رضي الله عنه) ده‌فه‌رموێت : پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) فـه‌رمووی : (( انَّ الرجـل الذي مات بينكم قد احتبستْ عن الجنة من أجل الدّين الذي عليه ، فـإنْ شـئتم فافـدوه ، وان شئتم فاسلموهُ إلى عذاب الله ))[٣٧١] . واته : ئه‌و پیاوه‌ی كه له‌ناوتاندا مـرد به‌نـدكراوه و قه‌ده‌غه‌كراوه له چوونه ناو به‌هه‌شت ،به هۆی ئه‌وه قه‌رزه‌ی كه له‌سه‌ریه‌تی ، گه‌ر ده‌تـا نـه‌وێت قه‌رزه‌كـه‌ی بـۆ بده‌نــه‌وه تـا ڕزگاربیێـت ، یـاخود لیٚ ی بگـه‌ڕێن وبیده‌نه‌ده‌سـت سـزای خـوا. [ده‌فه‌رموێت : ( بینیم خزمانی كه‌وتنه قه‌رزدانه‌وه بۆی تاكو هیچ قه‌رزێكیان به‌سه‌رمردووه‌كه‌وه نه‌هێشت))][٣٧٢] .

وه هه‌روه‌ها به‌ڵگه‌ی فه‌رمووده‌كه‌ی جابر (رضي الله عنه) ده‌فه‌رموێت : (جارێكیان پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) بانگ كرا بۆ نوێژ كردن له‌سه‌ر جه‌نازه‌یه‌ك كه نزیكی جه‌نازه‌كه بووه فه‌رمووی : له‌وه‌ده‌چیٚ ئه‌م برایه‌تان قه‌رزی له‌سه‌ر بوبێت؟ فه‌رموویان به‌ڵێ : پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) فه‌رمووی : چه‌ندی له‌سه‌ره: ووتیان : دینارێك ، فه‌رمووی : خۆتان نوێژی له‌سه‌ر بكه‌ن من نوێژی له‌سه‌ر ناكه‌م ، ئه‌بو قه‌تاده فه‌رمووی : دیناره‌قه‌رزه‌كه من ده‌یده‌مه‌وه ، ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا، نوێژی له‌سه‌ر بكه. ئنجا پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) نوێژی له‌سه‌ر كرد وه دوای ڕۆژێك له ناشتنی مردووه‌كه پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) پرسیاری له قه‌تاده كرد كه قه‌رزه‌كه‌ی داوه‌ته‌وه؟ ووتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا(صلى الله عليه وسلم) دوێنیٚ مردووه فریا نه‌كه‌وتووم بۆ ڕۆژیی دوایی دیسان پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) به قه‌تاده‌ی فه‌رموو قه‌رزه‌كه‌ت داوه‌ته‌وه؟ قه‌تاده فه‌رمووی: (الحمدلله) ، پاشان پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) فه‌رمووی ((الأن حين بردت

---

(٣٧٠) أخرجه : أحمد (٢٠١٥٧) وقـال محققـه : اسـناده صـحيح ، و الحـاكم في ((المستدرك)) (٢/٢٥) ، وصـححه الـشيخ الألباني في ((أحكام الجنائز)) (ص:٢٦) .

(٣٧١) أخرجه: الحاكم (٢/٢٥) وصححه على شرطهما و وافقه الـذهبي ، وصححه الـشيخ الألبـاني ايضاً على شرطهما في ((أحكام الجنائز))(٢٦) .

(٣٧٢) أخرجه: أبو داود في ((السنن)) (٣٣٤١) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن أبي داود)) (٢٨٥٨) .

علیه جلده))[٣٧٣]. فەرمووی : ئا ئێستا سزاکەی لەسەر لابرا و پێستی سارد بووەوە. پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە قورس و گرانی سزای قەرزار ڕوونی کردوەتەوە ، وەك عمری کوڕی جەحش (رضي الله عنه) دەفەرموێت : (پێغەمبەر(ﷺ) دانیشت بوو لە ناو مزگەوتدا لەوجێگەیە کە جەنازەمان لێ دادەنا ، وە سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و دوایی سەری دانەواند ، ئینجا دەستی بە ناوچەوانیەوە گرت و فەرمووی :(سبحان الله ، سبحان الله ما انزل الله من التشدید!) واتە: خوای گەورە چەند قورس و گرانی یەکی دابەزاندووەتە خوار؟ دەفەرموێت: کە ئەوەمان گوێ لێ بوو زانیمان و بێ دەنگ بووین وە بۆ ڕۆژی دوای ئەو پرسیارم کردو ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم قورس و گرانی یە چی یە هاتۆتەخوار ؟ فەرمووی : سەبارەت بە قەرزە سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە گەر پیاوێك شەهید بێت لە پێناوی خواداو زیندو بکرێتەوە دیسان بکوژرێت و شەهید بکرێت و جارێکی تر زیندو بکرێتەوە و شەهید بێتەوە گەر قەرزار بێت ناچێتە بەهەشتەوە تاوەکو قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە)[٣٧٤] .

## پێنجەم : پاسەوانی کردن لە پێناوی خوادا :

(فضالة بن عبید) (رضي الله عنه) دەفەرموێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ((كـل میـت یختم علـی عمله الا الـذی مـات مرابطـا فانـه ینمولَـهُ عملـه الی یـوم القیامـة ..))[٣٧٥] . واتـه : هـەر

---

(٣٧٣) أخرجه: الحاكم في ((المستدرك)) (٥٨/٢) وصححه ووافقه الذهبى ، والبيهقي في ((السنن الكبرى)) (٧٤/٦)، وأحمد في ((المسند)) (٣٣٠/٣) ، وقال الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (٣٩/٣) رواه أحمد و إسناده حسن ، وحسن اسناده ايضاً الشيخ الألباني في ((أحكام الجنائز)) (ص/:٢٧).

(٣٧٤) أخرجـه: أحمد في ((المسند)) (٢٨٩/٥) ، والنسائي في ((السنن)) (٣١٥/٧) ،والحاكم في ((المستدرك)) (٢٥/٢) وصححه ووافقه الذهبي ،وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن للنسائي)) (٤٣٦٧) ولفظه (( كان رسول الله (ﷺ) قاعدا حيث توضع الجنائز ، فرفع رأسه قبل السماء ثم خفض بصره فوضع يده على جبهته فقال (سبحان الله، سبحان الله ، ما أنزل الله من التشديد) قال : فعرفنا وسكتنا (وفزعنا) حتى إذا كان الغد سألت رسول الله فقلت يا رسول الله ما هذا التشديد الذى نزل ؟ قال : في الديّن ، والذي نفسى بيده لو أن رجلا قتل في سبيل الله ثم احيي ثم قتل ، ثم احيي ثم قتل ، وعليه دين ، ما دخل الجنة حتى يقضى عنه دينه)) .

(٣٧٥) أخرجـه: مسلم في ((الصحيح)) (٤٩١٥) ، وأحمد في ((المسند)) (٢٢٠/٦) ، والنسائي في ((السنن)) (٣٩/٦)، والترمذي في ((السنن)) (١٦٢١) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٤٦٢٤) وقال محققه اسناده صحيح واللفظ له ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن الترمذي)) (١٣٢٢) ،وفي ((السلسلة الصحيحة)) (٥٤٩) .

مردوویەك کە دەمرێت مۆر دەدرێت لە نامـەی کردەوەکـانی و کۆتـایی پـێ دەهێنرێـت تـەنها موسوڵمانێك نەبێ کە پاسەوانی کردبێ لە پێناوی خـوادا دژ بـە دوژمنـانی خـوا . ئـەو کـارە چاکەکانی گەشەی پێ دەدرێت بۆی و زیاد دەکرێت تا ڕۆژی قیامەت .وفي رواية (( **من رابـط يوماً أو ليلة كان له كصيام شهر للقاعد ، ومن مات مرابطاً في سبيل الله أجرى الله له اجـره الذي كان يعمل : اجر صلاته و صيامه ونفقته ... ))**(٣٧٦) . واتە : هەرکەسێك تەنها شەوێك یان ڕۆژێك پاسەوانی کـرد بێـت پاداشـتەکەی وەك بـە ڕۆژوو بـوونی مانگێکـە بـۆ کەسـێکی دانیشتوو لە ماڵی خۆی . وە هەر کەسێك لە کاتی پاسەوانی کردنـدا لـە پێنـاوی خـوادا مـرد بێت، خوای گەورە پاداشتی نوێژ و ڕۆژووە و پارەی خەرجیەکانی و ئەو کارانەی ئـەنجامی داوە بۆ درێژە پێ دەدات و بەردەوامی دەکات.

## شەشەم : خێرو چاکەی بەردەوام و نەبڕاوە لەدوای خۆی ( صدقة جارية ):-

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: **((... إذا مات ابن ادم انقطع عمله الا مـن ثـلاث: صدقه جارية أو علم ينتفع به أو ولد صالح يدعو له)**(٣٧٧) .

واتە : ئادەمیزاد کە مرد کۆتایی بە کردەوەکانی دەهێنرێت تەنها لە سێ شت نەبێت خێرێکـی نەبڕاوە یان زانستێك سودی لێ وەربگیرێت یان منداڵێکی چاك دوعای بۆ بکات . ئـەو چـاکە و خێرە نەبڕاوانە پێغەمبەر(ﷺ) لە سێ فەرموودەدا بۆی ڕوونکردوینەتەوە.

**فەرموودەی یەکەم:** ئەنەس (رضي الله عنه) دەیگێڕێتەوە: لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە دەفەرموێت: **((سبع يجري للعبد أجرهن وهوفي قبره بعد موته : من علم علما أو اجرى نهرا أو حفر بئرا اوغرس نخلا او بنى مسجدا او ورث مصحفا او ترك ولدا يستغفر له بعد موته ...))**(٣٧٨) .

---

(٣٧٦) أخرجه : الطبراني (الكبير) (٩١٧٩) ، أحمد (٢٣٧٢٧) وقال محققه الأرناؤوط : حديث صحيح .

(٣٧٧) أخرجه : مسلم في ((الصحيح)) (١٦٣١) ، وابو داود في ((السنن)) (٢٨٦٣)، و في رواية : ((ثلاث تنـال المؤمن بعد وفاته : الولد الصالح يدعو له من بعد وفاته فيناله أجر دعائـه ، و الرجـل يـترك الـصدقة في الموضـع الـصالح فتنفذ لوجهها ، و الرجل يعلم العلم الصالح فينتهي بـه عـن المعاصي)) انظـر : ((جامع بيـان العلـم)) لابـن عبـد الـبر رقـم (٧١/١)) رقمه (٥٥) وقال محققه : الحديث صحيح.

(٣٧٨) أخرجه: البزار(١٤٩) ، وابونعيم (الحلية) (٢/ ٣٤٣) ، والديلمي في (الفردوس) (٣٤٩٢) ، وحسنه الشيخ الألبـاني في ((الصحيح الجامع)) (٣٦٠٢) .

واتە: هەرکەسێك زانیاریەك فێری یەکێك بکات دوای خۆی [ بە پلەی یەکەم زانیاری **(العلوم الاسلامیة)** کە قورئان و سوننەتە پاشان هەندێ زانستی دنیایی کە سودمەند بێت ] یاخود ڕێرەوی ڕووبارێکی گواستبێتەوە ، یان جۆگەیەك ئاوی بۆ ناو چەیەك برد بێت ، یاخود بیرێکی ئاوی هەڵکەند بێت ، یاخو خورما (یان درەختێکی ) ڕرواند بێت ، یاخود مزگەوتێکی بنیات نابێت ، یاخود قورئانێکی دەس نووسی لە دوای خۆی بەجێ هێشت بێت ، یاخود منداڵێکی لە دوای خۆی بەجێ هێشت بێت داوای لێ خۆش بوونی بۆ بکات .

**فەرموودەی دووەم** : پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : **((إن مما يلحق المؤمن من عمله وحسناته بعد موته عِلماً علّمهُ ونشره، وولدا صالحا تركه، أو مصحفا ورثه، أو مسجدا بناه ، أو بيتا لإبن السبيل بناه ، أو نهرا أجراه، أو صدقة أخرجها من ماله في صحته وحياته يلحقه من بعد موته))**(٣٧٩) واتە : لەوانەی کە خاوەن باوەڕ پێی دەگات لە کردەوە چاکەکانی خۆی دوای مردنی ، زانستێکە کە فێری بوو بێت و خەڵکانی فێرکردبێت و بڵاوی کردبێتەوە،(٣٨٠) .

وە هەروەها کوڕێکی چاکەکار کە لە دوای خۆی بەجێ ی هێشتبێت ، وە یاخود قورئانێکی لە دوای خۆی بەجێ هێشت بێت، یاخود مزگەوتێکی دروست کردبێت ، یاخود خانوویەکی بۆ ڕێبوار دروست کرد بێت ،وەیاخود جۆگەیەکی هەڵبەستبێت کە خەڵکی سوودی لێ ببینن ، یاخود خێر وچاکەیەکی بەردەوام لە ماڵ و سامانی خۆی ئەنجامدا بێت لە کاتی لەش ساغی و ژیانی دنیایدا ، وە لە دوای مردنیشی بەردەوام بووبێت .

**فەرموودەی سێیەم** : هەڵکەندنی گۆڕ بۆ مردوو ، ئەبو رافع (رضي الله عنه) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی : **(( ... من حفر لَّميتٍ قبراً فاجَنَّهُ فيه أجرى الله لهُ من الأجرِ كأجرِ مسكنٍ اسكنه إلى يوم القيامة))**(٣٨١) . واتە: هەر کەسێك گۆڕێك بۆ مردوویەك

(٣٧٩) أخرجه :ابن ماجة في ((السنن)) (٢٤٢) ، وابن خزيمة (٢٤٩٠) ، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (١٩٨) ، وفي ((صحيح الترغيب والترهيب)) (٧٤) .

(٣٨٠) بەڵام زانستەکە شەرعی بێت واتە بە گوێرەی قورئان و سونەت بێت ، لەوە دەچێت ـ والله أعلم ـ زانستی دنیاش بگرێتەوە یاخود پیشەیەك کە بۆ بەرژەوەندی و سوودی دنیای کەڵکی لێ وەربگیرێت

(٣٨١) أخرجه : الحاكم (٣٥٤/١) وصححه و وافقه الذهبي ،وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٣٤٩٢).

هەڵ بکەنێت و تیایدا بیشارێتەوە، خوا پاداشتی ئەو کارەی بۆ بەردەوام دەکات وەك پاداشتی یەکێك خانوویەکی بۆ هەژاێك کرد بێت وە تیایدا نیشتەجیّ ی کرد بێت تا ڕۆژی کۆتایی .

**حەوتەم : جیّ بەجیّ کردنی ئەو نەزرەی کە مردووەکە لەسەر خۆی بڕیارداوە و نەی توانیوە ئەنجامی بدات وەکو ڕۆژوو وحەج[٣٨٢] کە دوای خۆی بۆی جیّ بەجیّ بکرێت سوودی لیّ دەبینێت.**

ئیبن و عەباس (رضي الله عنه)دەفەرموێت : ((إن إمراة ركبت البحر فنذرت ، لو أن الله تبارك وتعالى أنجاها أن تصوم شهرا ، **فأنجاها الله عز وجل فلم تصم حتى ماتت فجاءت قرابة لها** (إما أختها أو إبنتها) إلى النبي (صلى الله عليه وسلم) **فذكرت ذلك له فقال** : ((أرأيتك لو كان عليها دين أكنت تقضينه ؟) **فقالت : نعم ،قال** (فدين الله أحق أن يقضى،(فـ)[أقض عن أمك ]))[٣٨٣]

واتە : ئافرەتێك سواری کەشتیەك بوو دوای ئەوە زریانێك هەڵی کردو ئەویش نەزری کرد لەسەر خۆی گەر خوای گەورە ڕزگاری بکات یەك مانگ بەڕۆژوو ببێت ئەوە بوو خوای گەورە ڕزگاری کردوو نەزرەکەی نەهێنایە دی تاوەکو وەفاتی کرد ، وە خزمێکی (خوشکەکەی یان کچەکەی بوو) هاتە لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وە بۆی گێڕایەوە ، وە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پیّی فەرموو : ئایا ئەگەر قەرزاری خەڵك بوایە تۆ قەرزەکەت بۆ ئەدایەوە ؟ ووتی: بەڵیّ ، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : قەرزی خوای گەورە شایستە ترە ، قەرزەکە بدەرەوە لە جیاتی دایکت . وە هەروەها پاداشتی خێرکردن بۆ مردوو لە خزمی خۆیەوە پیّی دەگات و سوودی لیّ دەبینێت .

لە ڕیوایەتێکی تردا (ابن عباس) (رضي الله عنه) دەفەرموێت : ئافرەتێکی تر هاتە خزمەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ووتی : من خوشکەکەم مردووە و قەرزاری ڕۆژووی (نەزری) دوو مانگی بەدوای یەکدایە؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : (( **أرايتك لو كان على أختك دَينٌ اكنت قضيته ؟**)) واتە : گەر خوشکەکەت قەرزاری کەسێك بێت ئایا تۆ قەرزەکەی بۆ دەدەیتەوە؟

---

(٣٨٢) أنظر هذا الموضوع بتوسع في ((أحكام الجنائز)) (ص: ٢١٣ـ ٢١٧)، و في ((تمام المنة)) (صفحة:٤٢٧)،و فتاوى علماء البلد الحرام ) (ص: ٨٠٣).

(٣٨٣) أخرجه: أبو داود (٣٣٠٨)، والنسائي (١٤٣/٢)، وأحمد (١٨٦١) ، والبيهقي (الشعب)(٢٥٥/٤) ، و صححه الشيخ الألباني في ((صحيح أبي داود)) (٢٨٢٩) ، وصحيح النسائي (٣٥٧٣) ، و في ((أحكام الجنائز)) (ص : ٢١٤)

ووتی بەڵی . پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ((فحق الله احق ))[٣٨٤] . واتە : قەرز و مافی خوا لە پێشترە بۆ دانەوە .

وە پرسیاریان لە ئیبن و عەباس کرد (رضي الله عنه) ووتیان : ئەو کەسەی لە ڕەمەزان دا نەخۆش دەکەوێ و دەمرێت و ڕۆژووی ڕەمەزانی نەگرتووە ئایا خزمانی چی بۆ بکەن ؟ ئەویش فەرمووی: ئەگەر لەمانگی ڕەمەزاندا نەخۆش کەوت و مرد، وە نەیتوانی ڕۆژوو بگرێت ئەوا خزمانی دەتوانن لە جیاتی هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك بدەن بۆی وە پێ ی دەگات . بەڵام ئەگەر نەزر بێت بێگومان دەبێت بەڕۆژوو بن و کەفارەت جێ ی ناگرێتەوە)[٣٨٥] وە هەروەها ئیبن و عەباس دەفەرموێت : ((إن إمرأة من جهينة جاءت الى النبـي (ﷺ) فقالت : إن أمي نذرت أن تحج فلم تحج حتى ماتت أفأحج عنها ؟ قال: حجي عنها أرأيت لو كان على أمك دين أكنت قاضيه ؟ أقضوا الله فالله أحق بالقضاء)) [٣٨٦] .

واتە: ئافرەتێك لە جوهەینەوە هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) ووتی : دایکم نەزری کردبوو لە سەر خۆی حەج بکات بەڵام حەجی نەکرد تاوەکو وەفاتی کرد ئایا دەتوانم حەجەکەی بۆ بکەم ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : حەجی بۆ بکە لە جیاتی ئەو ئەگەر دایکت قەرزاری یەکێك بوایە جێ ی خۆی نەبوو کە قەرزەکەی بۆ بدەیتەوە ؟ قەرزەکەی بۆ بدەنەوە چونکە قەرزی خوای گەورە شایستە ترە بدرێتەوە .

## هەشتەم : ئەو کارە چاکانەی کوڕی خێرخوازی مردووەکە ئە نجامی دەدات:

باوك خاوەنی کوڕە و خاوەنی سامان و کردەوەی کوڕەکەیەتی وەکو پێغەمبەر(ﷺ) بە ئیبن عومەری(رضي الله عنه) فەرموو : ((أنت ومالك لأبيك)) واتە : تۆ و سامان و ماڵەکەشت هی باوکتە، وە عائیشە (رضي الله عنها) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی :

---

(٣٨٤) أخرجه: ابن خزيمة في ((الصحيح)) برقم (٢٠٥٥) وقال محققه الشيخ الألباني رحمه الله : اسناده صحيح على شرط مسلم .

(٣٨٥) أخرجه : أبو داود في ((السنن)) (٢٤٠١) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن أبي داود)) (٢١٠١) ، وفي ((أحكام الجنائز)) (ص:٢١٥)

(٣٨٦) أخرجه: البخاري في ((الصحيح)) (١٨٥٢) .

((إن أطيب ما يأكل الرجل من كسبه وإن ولده من كسبه)) [٣٨٧]. واتە : شیرین ترین شتێك كە پیاو خواردبێتی ئەوەیە كە بە ڕەنجی خۆی كردبێتی منداڵیش لە چاكترین ڕەنجی خۆیەتی ، واتە وەك ((صدقة جارية)) وایە چونكە تا ئەو كوڕە نوێژو ڕۆژوو و عیبادەت بكات لە ژیانی دنیایدا چەندە بۆ خۆی دەنووسرێت ئەوەندە بۆ دایك و باوكی دەنووسرێت (والله أعلم).

پێغەمبەر(ﷺ) ڕوونی كردۆتەوە ئەگەرمنداڵێكی چاك دوعا بكات یان داوای لێخۆش بوون بكات بۆ باوك و دایكی دەگات پێیان وە سوودی لێ دەبینن .

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : ئەگەر ئادەمیزاد مرد كردەوەكانی كۆتایی پێ دێن تەنها لە سێ شت نەبێت (كە دەقەكەی لەوەپێش باسكرا) ئینجا یەكێك لەو سیانە ((... ولد صالح يدعو له)) واتە : كوڕێكی چاكەكار لە دوای خۆی كە بۆی بپاڕێتەوە) [٣٨٨] .

وە ئەنەسی كوڕی مالیك (رضي الله عنه) دەفەرموێت : پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : ((حەوت شت هەن پاداشتەكەی دەگات بە مردووەكە لە گۆڕەكەیدا دوای مردن .... كە دواهەمینیان ...... ((أو ترك ولداً يستغفر له بعد موته)) [٣٨٩] واتە : منداڵێكی دوای خۆی جێ هێشت بێت كە داوای لێ خۆش بوونی بۆ بكات. ئەمەش نەك لە گۆڕ بەڵكو لە بەهەشتیشدا سوودی پێ دەگات بە بەڵگەی فەرموودەكەی ئەبو هەرەیرە (رضي الله عنه) كە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت :

((إن الله ليرفع درجة العبد الصالح في الجنة فيقول يارب أنّى لي هذه ؟ فيقول : بأستغفار ولدك لك)) [٣٩٠] واتە: خوای گەورە پلەی بەندەی چاكە كاری خۆی بەرز دەكاتەوە لە بەهەشتدا ئەویش دەڵێت :خوایە ئەم پلە بەرزەم بەهۆی چی یەوە دەست كەوت؟ خوای گەورەش پێی

---

(٣٨٧) أخرجه : النسائي في ((السنن)) (٢/٢١١) ،و ابن ماجة في ((السنن)) (٢١٣٧) ، و أحمد في ((السنن)) (٦/٤١) ، والحاكم في ((المستدرك)) (٢/٤٦) وصححه على شرطهما ووافقه الذهبي وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن النسائي)) (٤١٤٧) وفي صحيح ((سنن ابن ماجة)) (١٧٣٨) ، وفي ((المشكاة)) (٢٧٧٠) .

(٣٨٨) أخرجه : مسلم في ((الصحيح)) : (١٦٣١) .

(٣٨٩) أخرجه : البزار، وحسنه الشبيخ الألباني في ((الصحيح الجامع)) : (٣٦٠٢)

(٣٩٠) أخرجه: أحمد (١٠٦١٠) وقال محققه اسناده حسن ، وابن أبي شيبة (١٠/٣٩٦)، وابن ماجة (٣٦٦٠)، والبزار (٣١٤١)، والبيهقي (٧/٧٨)،وحسنه الشيخ الألباني في ((الصحيحة)) (١٥٩٨) و ((صحيح ابن ماجة)) (٢٩٥٣) و((صحيح الجامع)) (٣٦٠٢)

دەفەرموێت: بەهۆی داوای لێخۆشبوونی منداڵەکەت بۆت لە دوای تۆ)[٣٩١] واتە : داوای لێخۆشبوونی بۆ باوك و دایکی کردووە وە ئەو دوعایانە بۆتە هۆی پلە بەرز کردنەوەی پلەی باوکی لە بەهەشتدا. وە هەروەکو ووترا کوڕی چاك هەر کردەوەیەکی چاك بکات بۆ دایك و باوکی دوای مردنیان پێیان دەگات ، وە ئەگەر ئەوانیش لێ ی بێ ئاگابن و وەسێتیان بۆ نەکردبێت بەهەمان شێوە هەر پێیان دەگات بە بەڵگەی فەرموودەکەی ئیبن و عەباس (رضي الله عنه) کە دەفەرموێت : (سەعدی کوڕی عوبادە (رضي الله عنه) دایکی وەفاتی کرد لە کاتێکدا کە ئەو لەوێ نەبوو (واتە لە مەدینە) کە گەڕایەوە ووتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دایکم وەفاتی کردووە من لێرە نەبووم ئەگەر شتێکی بۆ بکەم بەخێر سودی پێ دەگەیەنێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بەڵێ ، سەعدیش فەرمووی ئەوا تۆ شاهید بە ئەو باخەم کە هەمووی هاتۆتە بەرهەم هەرهەمووی خێر بێت بۆ دایکم ...)[٣٩٢] .

گەیشتنی چاکەی منداڵ بۆ دایك و باوك تەنها بەمەرجێك دەبێت ئەویش ئەوەیە کە ئەو دایك و باوکە موسوڵمان وخاوەن باوەڕ بووبن، وەلەسەر ئەو بیرو باوڕە پاك و بەرزەش مردبن ... بە بەڵگەی فەرموودەکەی (عبداللە بن عمرو بن العاص) (رضي الله عنه): کە باپیرەی خۆی کافر بوو وە لە نەفامیدا مردبوو واتە (زەمانی جاهلی) وەسێتی کردبوو لەسەرە مەرگیدا کە(١٠٠) عەبدی بۆ ئازاد بکەن واتە کوڕەکانی (هشام) یان (عمرو) ، ئەوە بوو هیشام (٥٠) عبدی ئازاد کرد، وە (٥٠) ی مایەوە ، لەسەر (عمرو) ئینجا (عمرو) هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پرسیاری لێ کرد ئایا ئەویش ئەوەی کە ماوە تەواوی بکات ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: **((إنه لو کان مسلما فأعتقتم أوتصدقتم عنه أو حججتم عنه بلّغه ذلك))** وفي رواية : **((فلو کان أقر**

(٣٩١) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (٥٠٩/٢) ، وابن ماجة في ((السنن)) (٣٦٦٠) ، وقال ابن كثير في((البداية النهاية)) (٣٩٣/٢) رواه أحمد واسناده صحيح ، وحسن اسناده الحافظ العراقي في ((الاحياء)) (٩٨٢)، وحسنه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (٢٩٥٣) ، وفي ((صحيح الجامع)) (١٦١٧) وفي ((السلسلة الصحيحة)) (١٥٩٨) .

(٣٩٢) أخرجه: البخاري في ((الصحيح)) (٢٧٧٠) ، وابو داود في ((السنن)) (٢٨٨٢) ، والنسائي في ((السنن)) (١٣٠/٢) ، والترمذي في ((السنن)) (٦٦٩) ،وأحمد في ((المسند)) (٣٠٨٠) واللفظ له، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن أبي داود)) (٢٠٥٦) ، وفي ((صحيح سنن النسائي)) (٣٤١١) ، وفي ((صحيح سنن الترمذي)) (٥٣٧) .

**بالتوحيدفصمت أو تصدقت عنه نفعه ذلك))**[٣٩٣] واته: گەر باوكت موسوڵمان بوایه ئێوه عبدتان بۆ ئازاد بكردایەو حەجیشتان بۆ بكردایه،و خێر و چاكەشتان بۆ بكردایه پێی دەگەیشت. له ڕیوایەتێكدا: گەر باوكت باوەڕی به تاك و تەنهای خوا ببوایه ، تۆ ڕۆژووت بۆ بگرتایه یاخود خێرو چاكەت بۆ بكردایه ئەو سوودی لێ وەردەگرت .

بەو شێوەیه هەمو چاكەو خێرێك ئەگەر كوڕو كچ بیكەن تا وەكو پیر دەبن لەسەری دەگات به دایك و باوكیان له گۆڕەكەیاندا ، كەواته هەموو چاكەیەكی كوڕو كچ بۆ باوكی له مەسەلەی گەیشتن پێی و سود لێ وەرگرتنی تەنها بەستراوه بەیەك مەرجەوە ئەویش موسوڵمان بونیانه ، وه هەروەها چاكه كردن لەگەڵ خزمان و دۆستانی دایك و باوكدا ئەویش به چاكه كردن دانرێت لەگەڵ باوك و دایكدا له دوای مردنیان وەكو ئیبن و عومەر (رضي الله عنه) له پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) دەیگێڕێتەوەو كەفەرموویەتی : **((من أحب أن يصل أباه في قبره ، فليصل إخوان أبيه بعده...))**[٣٩٤] واته : هەركەسێك پێی خۆشه چاكه بكات لەگەڵ باوكیدا له گۆڕەكەیدا ئەوا با چاكه و بەسەركردنەوە بكات لەگەڵ دۆستان و خزمانی باوكیدا له دوای مردنی .

## سەردانی مردووەكان له گۆڕدا له نێوان خۆیاندا

ئەبو قەتادە دەفەرموێت : پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **((إذا ولى أحدكم أخاه فليحسن كفنه فانهم يتزاورون في قبورهم ويتزاورون في اكفانهم ...))**[٣٩٥] واته : هەركەسێك لەئێوه گەر كفنێكی بۆ براكەی خۆی كرد با كفنێكی چاكی بۆ بكات (واته كفنێكی پاكی تازە) چونكه ئەوانه بەكفنەكانیانەو سەردانی یەكتری دەكەن له گۆڕدا.

له ڕیوایەیەكی تردا: جابره دەگێڕێتەوه (رضي الله عنه) له پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) كه فەرموویەتی: **((حسنوا اكفان موتاكم ، فانهم يتباهون ويتزاورون فى قبورهم))** [٣٩٦]. واته : كفنی

---

(٣٩٣) أخرجه : أبي داود في ((السنن)) (٢٨٨٣) والبيهقي في ((السنن)) (٢٩٧/٦) والسياق لـه، وحسن اسناده الشيخ الألباني في ((صحيح سنن أبي داود)) (٢٥٠٧) ، وفي ((أحكام الجنائز)) (ص : ٢١٨) .

(٣٩٤) أخرجه : ابن حبان في ((الصحيح)) (٤٣٢) وقال محققه اسناده صحيح على شرط البخاري .

(٣٩٥) أخرجه : الترمذي في ((السنن)) (٩٩٠) ، وابن ماجة في ((السنن)) (١٤٧٤) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح سنن ابن ماجة)) (١٢٠٥) وفي ((السلسلة الصحيحة)) (١٤٢٥) وفي ((صحيح الجامع)) (٨٤٥) .

(٣٩٦) أخرجه الحارث بن أبي اسامة في ((المسند)) و ابن عدى في ((الكامل)) (١٠٥/٣) وقال السيوطى في ((اللآلي المصنوعة)) (٢٣٤/٢): حسن صحيح ، وله طرق و شواهد كثيرة ذكرتها في ((شرح الصدور)) (ص : ١٨٧) .

مردووەکانتان با باش بێت چونکە ئەوان شانازی دەکەن بە کفنەکانیانەوە و سەردانی یەکتر دەکەن لە گۆڕەکانیاندا .

ئیبن و قەیم (رحمه الله) دەفەرموێت : (ڕۆحەکان هەموویان دوو جۆرن جۆرێکیان سزا دراو و بەند کراون ، جۆرەکەی تریان کامەران و بەختەوەرو ئازاد و گەڕۆکن، وەسزا دراوەکان سەرقاڵن بە چەشتنی سزاوە بۆیە ناتوانن سەردانی خزم و کەسان و دۆستانی خۆیان بکەن لە گۆڕدا بەڵام ڕۆحە خۆش گوزەرانەکان بۆیان هەیە بچن بۆ هەموو شوێنێك ، ئەوانە بەیەك دەگەن ، و سەردانی یەکتر دەکەن ، و یادی ژیانی دنیا دەکەنەوەو بەسەرهاتی دنیا بۆ یەکتر دەگێڕنەوە ، وە هەموو ڕۆحێك لەگەڵ هاوێنەی ئاستی خۆیدایە دەبێت لە گۆڕدا وە ڕۆحی پێغەمبەریش(ﷺ) لەگەڵ (**الرفيق الأعلى**) دایە وەك خوای گەروە دەفەرموێت :

﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ﴿٦٩﴾ ﴾(النساء: ٦٩).

واتە: هەرکەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا بکات ئەوە لەگەڵ ڕاستگۆیان و پیاو چاکان و شەهیدەکان دایە . بۆیە ئەم لەگەڵ دا بوونە تایبەتە بەژیانی دنیاو ژیانی بەرزەخ و قیامەتە وە ((**المرأ مع من أحب**)) واتە: ئادەمیزادی موسوڵمان لەگەڵ ئەو کەسەدایە خۆشی ویستووە واتە لەگەڵ برایانی موسوڵمانی خۆیدا چۆن لە ژیانیدا هاوشێوەو تێکەڵی یەك بوون لە گۆڕیشدا بەو شێوەیەن واتە لەو سێ قۆناغەدا)[٣٩٧] .

## نوێژ کردنی مردووەکان لە گۆڕەکانیاندا

ئایا مردوو نوێژ دەکات لە گۆڕەکەیدا ؟ لەوەڵامدا دەڵێین : بەڵێ : بەبەڵگەی فەرموودەکەی ئەنەس کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : ((**مررت على موسى ليلة أسري بي وهو قائم يصلي في قبره عند الكثيب الاحمر**))[٣٩٨] واتە : ... تێپەڕیم بەلای موسادا لەو شەوەی شەو ڕەویم پێ کرا بینیم موسا (**عليه السلام**) وەستابوو بە پێوە لە گۆڕەکەیدا نوێژی دەکرد لای

(٣٩٧) ابن القيم في كتاب ((الروح)) (ص: ١٧) .

(٣٩٨) أخرجه : المسلم في ((الصحيح)) (٢٣٧٥) وأحمد في ((المسند)) (١٤٢/٣) ، والنسائي في ((السنن)) (٢٢٤/٣) ،وابن حبان في ((الصحيح)) (٥٠) وقال محققه: إسناده صحيح على شرط مسلم .

تەپۆڵکە سورەکەوە ، ئەمەش تایبەت نیە بە پێغەمبەر موساوە(علیه السلام) بەڵکو بۆسەرجەم پێغەمبەرانی تره (علیهم الصلاه والسلام) بە بەڵگەی فەرموودەکی ئەنەسەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : ((**الانبیاء أحیاء فی قبورهم یصلون**))[٣٩٩] واتە : پێغەمبەران زیندوون لە گۆڕەکانیاندا نوێژ دەکەن ..

ئیبن و ڕەجەب (رحمه الله) دەفەرموێت : (هەندێ لەکەسانی بەرزەخ و ناوگۆڕ خوای گەورە ڕێزی لێ گرتوون بەوەی کارە کانیانی بۆ بەردەوام کردوون لە ژیانی بەرزەخیاندا ، ئەگەر پاداشتیشی لەسەر وەرنەگرن بەڵام شاد و کامەران دەبن پێی وەك چۆن ئەهلی بەهەشت و فریشتە بەڕێزەکان شادو کامەرانن بەزیکرو یادی خواو عیبادەت ، هەرچەندە پاداشتیشیان نی یە بەڵام بەو شێوەیە ئەو زیکر و یاد و خوا پەرستیە لای کەسانێك کە ئەهلی ئەوە بن ، زۆر خۆشی و شادی لێ وەردەگرن ، و پێیان خۆشترە لە هەموو چێژو خۆشی دنیا . خوای گەورە ئەو چاکانە درێژەی پێ دەدات بۆیان لە ژیانی گۆڕیاندا بۆ ئەوەی زیاتر بەختەوەر بن وە هیچ کەسێك بە وێنەی سوودو لەزەت وەرگرتن لە یادو بەندایەتی خوا لەزەتی وەرنەگرتووە لە هیچ شتێکی تری دنیا وەك باوەڕدار ئەو چێژو لەزەتەی وەرگرتووە)[٤٠٠] .

شێخی ئەلبانی (رحمه الله) دەفەرموێت : ( (ئیبن التین) کە یەکێکە لەوانەی کە هەستاون بە ڕاڤەکردنی (**صحیح البخاري**) کەوتویەتی ((**الموتی لا یصلون**)) واتە: مردووەکان نوێژ ناکەن لە گۆڕەکانیاندا : شێخ ئەلبانی دەفەرموێت : ئەوە ڕاست نی یە وەهیچ دەقێکیش نەهاتووە دژی ئەوە بوەستێ بەڵکو هاتووە کە ئەو ووتەیە بڕوخێنێت وە پووچی بکاتەوە کە ئەویش نوێژ کردنەکەی پێغەمبەر موسایە لە گۆڕەکەیدا . وەکو پێغەمبەر(ﷺ) لەشەو ڕەویەکەیدا بینی وە هەروەها سەرجەم پێغەمبەران لە دوای مردنیان لە ((**بیت المقدس**)) نوێژیان کردووە بە جەماعەت وە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتووە کە پێغەمبەران زیندوون لە گۆڕەکانیان دا نوێژ دەکەن بەڵکو دەفەرموێت لەوە گشتی تر بەڵگە هاتووە کە ئەویش لە فەرموودەکەی (براء) دا

---

(٣٩٩) أخرجه : البزار في ((المسند)) (٢٥٦) ، و ابو يعلى في ((المسند)) (٣٤٢٥) ، وابن عدى في ((الكامل)) (٢/٩٠) ، وصححه الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٦٢١) وفي ((صحيح الجامع)) (٢٧٩٠) وفي ((أحكام الجنائز)) (ص: ٢٧٧) .

(٤٠٠) ابن رجب في ((اهوال القبور)) (ص : ٥٢) .

هاتووە لە پرسیاری دووفریشتەکە لە گۆڕدا کە بە ئادەمیزادە موسوڵمانەکە دەڵێن دانیشە ئەویش دادەنیشێت پاشان لێی دەپرسن ئەو کەسەی کەوا نێراوە بۆ ناوتان کێیەو تۆ چ شایەتیەك دەدەی بەرامبەری ئەویش دەڵێ: (( **دعوني حتى أُصلي**)) واتە: وازم لێبێنن تا نوێژەکەم بکەم دووفریشتەکەش پێی دەڵێن : جارێ تۆ وەڵامی پرسیارەکەمان بدەرەوە (( **إنَّكَ ستُصلي**)) واتە: تۆ دوایی نوێژی خۆت دەکەیت ، دەفەرموێت ئەمە فەرمودەیەکی ڕاشکاوە (صریح)ە بەوەی کە خاوەن باوەڕان هەر هەموویان نوێژ دەکەن لە گۆڕەکانیاندا دوای مردنیان وە ئەو قسەیەی کە دەڵێ ((**الموتى لا يصلون في قبورهم**)) پووچەڵ دەکاتەوە )[٤٠١] .

## دایەنگاکردن و شیردان بەسەرجەم کۆرپەی باوەڕداران لەبەرزەخدا (واتە: ژیانی ناو گۆڕ)

بەڵگەش بۆ ئەم باسە فەرموودەکەی عەمری کوڕی سەعیدە (رضي الله عنه) کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت : ((**إنَّ ابراهيم ابني ، وانه مات في الثدي وان له لظئرين يكملان رضاعته في الجنة**))[٤٠٢] .واتە: ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تەمەنی ساڵ و نیوێك بوو مرد کە هێشتا نیوساڵی شیر خواردنی ما بوو ، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : (ئیبراهیم کوڕی منە و لەماوەی شیر خواردنیدا مردووە خوای گەورە دووشیر دەری بۆ ئامادەکردووە کە شیردانەکەی بۆ تەواو دەکەن لە بەهەشت دا ).

وە لە ڕیوایەتێکی تردا : ((**ان له مرضعاً في الجنة**))[٤٠٣]. واتە: دایەنێك و شیردەرێکی هەیە لە بەهەشت دا ، ئەمە تایبەتە بە کوڕەکەی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) ((ئیبراهیم)). بەڵام بەخێوکردن و شیردانی سەرجەم جگەر گۆشەو کۆرپەی موسوڵمانان کە لە منداڵیدا مردوون ئەو ئەرکە باوەگەورەمان (ئیبراهیم) (**عليه السلام**) گرتویەتیە ئەستۆ لەگەڵ خێزانی بەڕێزی دا (ساراخان)

(٤٠١) الشيخ الألباني في ((أحكام الجنائز)) (ص : ٢٧٢) .

(٤٠٢) أخرجه : مسلم في ((الصحيح)) (٥٩٨٠) .

(٤٠٣) أخرجه : البخاري في ((الصحيح)) (١٣٨٢) ، وأحمد في ((المسند)) (٣٠٠/٤) ، والحاكم في ((المستدرك)) (٣٨/٤) ، والبيهقي في ((السنن الكبرى)) (١٣٩/١) .

له بهههشتدا تا ئهو جگهر گۆشانه دهگێڕنهوه بۆلای دایك و باوكانی بهڕێزی خۆیان له دوای چونه بهههشتیان.

له ئهبو هورهیرهوه (رضي الله عنه) دهفهرموێت: پێغهمبهر(صلى الله عليه وسلم) فهرمووی: ((**اولاد المؤمنين في جبل في الجنة يكفلهم ابراهيم وسارة حتى يردهم الى آبائهم يوم القيامة ...**))[٤٠٤] واته : منداڵهكانی خاوهن باوهڕان له شاخێكدان له بهههشت دا ، ئیبراهیم و ساره ئهو منداڵانه دهگرنه ئهستۆی خۆیان تاكو دهیگێڕنهوه بۆ باوكانی خۆیان له ڕۆژی قیامهت دا.

وه بهڵگهی دووهمان : فهرموودهكهی ئهبو ئومامه یه (رضي الله عنه) دهفهرموێت : پێغهمبهر(صلى الله عليه وسلم) فهرمووی : ((**...ثم إنطلقنا فإذا نحن بغلمان وجوار يلعبون بين نهرين قلت ما هؤلاء؟ قال : ذرية المؤمنين ((يحضنهم إبراهيم))...**))[٤٠٥] واته: ڕۆیشتین تا گهیشتین به كچان و كوڕانێكی منداڵ یاریان دهكرد له نێوان دوو ڕووباردا ، ووتم : ئهوانه كێن ؟ ووتیان ئهوانه كۆرپهی خاوهن باوهڕهكانه ، (ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ) دهیانگرێته باوهش و پهروهرده و سهرپهرشتیان دهكات...

وههروهها بهڵگهی سێههمیش : فهرموودهكهی (**المقدام بن معد يكرب**) له پێغهمبهرهوه(صلى الله عليه وسلم) فهرموویهتی:

((**مامن أحد يموت سقطا ولا هرماً ، وإنما الناس في ما بين ذلك إلأ بعث إبن ثلاث وثلاثين سنة**))[٤٠٦] واته: ههركهس به لهبار چوویی مرد بێت یان به پیری وه خهڵكان له نێوان ئهو دوو تهمهنهدان ، كاتێك كه زیندوو دهكرێنهوه له تهمهنی سی و سێ ساڵی دان . ئهمهش دهكرێته بهڵگه لهسهر سهرپهرشتی كردنی پێغهمبهر ئیبراهیم (**علیه السلام**) بۆ ئهو منداڵانه .

---

(٤٠٤) أخرجه : أحمد في ((المسند)) (٣٢٦/٢) ، وابن أبي شيبة في ((المصنف)) (٣٧٩/٣) ، و البيهقي في ((البعث)) (٢١٠) ، وابن حبان في ((الصحيح)) (٧٤٤٦) وقال محققه حديث حسن ، والحاكم في ((المستدرك)) (٣٨٤/٣) وصححه على شرطها ووافقه الذهبي، وحسن اسناده أحمد شاكر في ((المسند)) (٨٣٠٧) ، وحسنه ايضاً الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٦٠٣ ـ ١٤٦٧) ، وفي ((صحيح الجامع)) (٣٤٢٨) واللفظ لأحمد والحاكم .

(٤٠٥) أخرجه : الطبراني في ((المعجم الكبير)) (٧٦٦٦) ، وجود إسناده الحافظ في ((فتح الباري)) : (٥٤٥/١٢) ، وصححه الشيخ الألباني في ((صحيح الترغيب)) (٩٩٥) .

(٤٠٦) أخرجه: الطبراني في ((المعجم الكبير)) (٦٣٣/٢٠) ، وحسن إسناده الهيثمي في ((مجمع الزوائد)) (٣٣٤/١٠) والمنذري في ((الترغيب)) (٢٧٣/٦) ،وصحح إسناده الشيخ الألباني في ((السلسلة الصحيحة)) (٢٥١٢) .

## ئایا مردووەکان گوێیان لە دەنگ و ئاخاوتنی زیندووەکان هەیە لە هەندێك کاتدا؟

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت : ﴿ فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْاْ مُدْبِرِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾ (الروم: ٥٢ ) واتە: ئەی محمد تۆ ناتوانیت قسە بکەیتە مێشك و گوێی ئەوانەوە، (واتە : ئەو مردوانە) وە هاواریش ناتوانیت بگەیەنیتـە ئـەو کەڕانـەی کـە پـشتیان لـە دیـن هەڵکردووە . زانایانی تەفسیر ڕایان گەیاندووە کە مەبەسـت لێـرەدا مـردوو نـی یـە ، بـەڵکو مەبەست لێرەدا ئەو مردووانەیە کە لە ژیانیاندا مردوون و سوودیان لە ووتەی خوا وەرنـەگرتووە وە گوێ بیستی نەبوون . پایە بەرز (ئیبن و جەریری طبری) ـ رحمـە الله ـ دەفـەرموێت : (واتـە ئەی محمد تۆ ناتوانیت ئایەتەکانی خوا بگەیەنیتە گوێی (یان تێیان بگەیەنیت) ئـەو کەسـانەی کە خوا مۆری ناوە بە دڵیانەوە وە مراندوونی)[٤٠٧]، مردوو مەبەست لەو مردووانەن کـە بـە دڵ مردوون و ڕووناکی باوەڕ لە دڵیاندا نیە خوا گـەورە خـۆی دەفـەرموێت : ((أو مـن کـان میتـا فأحييناهُ...)) واتە:چۆن دەبن بەیەك ئەوانەی زیندوون لەگەڵ ئەوانەی کە مـردوون ... کەواتـە خوای گەورە لێرەدا مەبەستی لە مردوو نی یـە بـەڵکو مەبەسـتی بـەراوردە لـە نێـوان کـافرو موسوڵماندا ، کافری بە مردوو داوەتە قەڵەم ، وەکو پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : ((مثل الذی یذکر ربه والذی لایذکر ربه کمثل الحي والمیت ....)) واتە: نموونەی ئەو کەسانەی کە یادی خوا دەکەن لەگەڵ ئەو کەسانەی کە یادی خوا ناکەن وەك نموونەی زیندو و مـردوو وان ، مانـای ئەوە نی یە کە ئەو موسوڵمانانەی زیکری خوا ناکـەن مـردوون ، مەبەسـتەکەی ئەوانەیـە کـە مردووی بیر و هۆش و دڵن ....

ئیبن و جەوزی ـ رحمه الله ـ دەفەرموێت : (زانایانی تەفسیر دەڵێن : ئەمە نموونەیەکە کە خوای گەورە هێناویەتەوە بۆ کافران و هاوشێوەی کردوون بە مردووان .)[٤٠٨]

---

(٤٠٧) الطبری : في ((جامع البيان)) (١٦/١١).

(٤٠٨) ابن الجوزی : في ((زاد المسير)) (٨٤/٦) .

( ئیبن و کثیر) ـ رحمه الله ـ دەفەرمویّت : [واتە : ئەی محمد تۆ ناتوانیت شتیّك بگەیەنیت بەو مردووانە کە ئەوان سوودی لیّ وەربگرن چونکە ئەوان پەردە و مۆری کوفر دڵ و گوێیانی داپۆشیوە لەبەر ئەوە خوای گەورە دەفەرمویّت :

﴿ فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٢﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِ ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ (الروم: ٥٢ – ٥٣) واتە: ئەی محمد تۆ ناتوانی ئایەتەکانی خودایان تێبگەیەنی لەوانەی کە گوێ بیستی نابن یا چاو بینی ڕاستی نابن بەڵکو تەنها ئەوانە تێدەگەن کە باوەڕیان بە ئایەتەکان هەیەو موسوڵمانن .

وە لە ئایەتی تردا هاتووە :﴿ ......وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ...... ﴿١٧٩﴾ ﴾ (الأعراف: ١٧٩) ﴿ إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ ۘ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ (الأنعام: ٣٦ ) [٤٠٩] .واتە : کێ سوود لەئایەتەکانی خوا وەردەگرێت ئەوانە کە گوێیان هەیە و گوێ بیستی خوا و پێغەمبەرانن ، هەروەها بەڵگەش ئەو ئایەتەی خوای گەورەیە کە دەفەرمویّت :﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ .... ﴿١٧٩﴾ ﴾ (الأعراف: ١٧٩) . واتە: کۆمەڵێکی تایبەتمان درووست کردووە بۆ دۆزەخ ... گوێیان هەیە بەڵام پیّ ی نابیستن ، کەواتە لەوە دەچێت گوێی لیّ بێت بەڵام نایبیستێت و سوودی لیّ نابینێت و ناچێتە دڵی یەوە و نایکات بەکردەوە وەکو خوای گەورە دەفەرمویّت:

﴿ إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ ۘ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ (الأنعام: ٣٦ ) واتە: ئەوانە گوێبیستن کە گوێ دەگرن بۆ ئەم ئاینە و پیّی ڕازین یان دەفەرمویّت

﴿ ..... أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾ ﴾ (ق: ٣٧) واتە: ئەو کەسەی کە گوێی قوڵاخ کردووە و بەئاگایە مەبەستی ئەم ئایەتە گوێ گرتن و سوود لیّ وەرگرتن و کارپیّکردنە ،کەواتە مەبەست لە ئایەتەکە بە ووتەی ئەم (مفسر)ە ئەوەیەکە مردوو گوێی لە قسەی زیندوو نی یە] بەڵگەی تریش بۆ ئەم باسە فەرموودەکەی ئەبو تەڵحەیە (رضي الله عنه) کە دەفەرمویّت :

---

(٤٠٩) ابن كثير : في ((تفسير القرآن العظيم)) (٦/٣٦٤).

((لما كان يوم بدر وظهر عليهم النبي (ﷺ)أمر ببضعة وعشرون ( وفي رواية أربعة و عشرين) رجلا من صناديد قريش فألقوا بهم في طوى من أطواء بدر ، وإن رسول الله ناداهم قال : ((يا أباجهل بن هشام ، يا أمية بن خلف ، يا عتبة بن ربيعة ، يا شيبة بن ربيعة أليس قد وجدتم ما وعد ربكم حقا ؟ فإني قد وجدتُ ما وعدني ربي حقا؟)) فقال عمر: يا رسول الله: ما تكلم من أجساد لا أرواح فيها ، فقال :(( والذى نفسي بيده ما أنتم بأسمع لما أقول منهم ، [ولكن لا يقدرون أن يجيبوا ])) (٤١٠) واتە: کاتێك کە جەنگی بەدر بوو خوای گەورە پێغەمبەری (ﷺ) بالآدەست کرد بەسەر کافرەکاندا لە دوای تەواو بوونی جەنگەکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بیست و چوار سەرکردە و ناوداری قورەیش کە کوژرابوون بکرێنە چاڵێکی پیس لە چاڵەکانی بەدر ، پێغەمبەر(ﷺ) دوای ئەوە بە سێ ڕۆژ کە وویستی ئەو شوێنە بەجێ بهێڵێت هات لای ئەو چاڵەوە وەستاو بانگی لێکردن و فەرمووی : (هۆ ئەبو جەهلی کوڕی هشام ، ئومەیەی کوڕی خەلەف و عوتبەی کوڕی ڕەبیعە .. ئایا پێتان گەیشت ئەوەی خوای گەورە پەیمانی پێ دابوون بە ڕاستی من ئەوەی خوای گەورە پەیمانی پێدام پێی گەیشتم)... ئیمامی عومەر فەرمووی : ئەی پێغەمبەر خوا تۆ چۆن قسە دەکەیت لەگەڵ چەند لاشەیەکدا کە ڕۆحیان تیا نەماوە ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەوان چاکتر لە ئێوە گوێ یان لێ یە ئەوەی کە من دەیلێیم بەڵام ناتوانن وەڵام بدەنەوە . لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : ((إنهم الآن يسمعون ما أقول لهم))(٤١١) واتە : ئەوان ئێستا گوێیان لە قسەکانی منە ....قەتادە دەفەرموێت : خوای گەورە زیندوی کردنەوە لەو کاتەدا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی زیاتر سووك و ڕیسواو بچوك و زیاتر ڕەزیل بن و خەفەت و مەراق بێت بۆیان...)(٤١٢) .

عائیشە (رضي الله عنها) نکوڵی کردووە کە مردوو گوێی لە زیندوو بێت وە فەرموویەتی پێغەمبەر(ﷺ) وای نەفەرمووە بەڵکو فەرموویەتی : (( إنهم ليعلمون الآن ما كنت أقول لهم

---

(٤١٠) أخرجه : البخاري في : ((الصحيح)) : (٣٠٦٥) ، ومسلم في ((الصحيح)) : (٢٨٧٥)

(٤١١) أخرجه : البخاري في : ((الصحيح)) : (٣٩٦٧) ، ومسلم في ((الصحيح)) : (٩٣٢)

(٤١٢) أخرجه : البخاري في : ((الصحيح)) : (٣٩٧٦) ، و انظر : ((أضواء البيان)) للشنقيطي (٢/٣٣٥).

